پرۆژەی تیشک (٥٤)

# ئاین لە فیکری مەسعود محەممەد دا

عومەر عەلی غەفور

٢٠٠٩

بسم الله الرحمن الرحيم

ناوی کتێب:  ئاین لە فکری مەسعود محەممەد دا
نووسینی:  عومەر علی غفور
ژمارەی سپاردن: ژمارە ( ١٧ ) ساڵی (٢٠٠٩)
نۆرەی چاپ: یەکەم
ساڵی چاپ: ٢٠٠٩
نەخشەسازیی بەرگ و ناوەوە: سیف و سرمد
لە بڵاوکراوەکانی: پرۆژەی (تیشک)، ژمارە (٥٤)
ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت:
www.tishkbooks.com
ئیمەیلی پرۆژە:
info@tishkbooks.com
tishkbooks@yahoo.com

# پێرست

## پێشەکی

سەرەتای ئاشنایم بە نووسینەکانی مامۆستا مەسعود محەمەد بۆ ساڵی ١٩٨٩ دەگەڕێتەوە کاتێ بۆ یەکەم جار لە یەکێ لە کتێبخانەکانی سەر شۆستەکانی سلێمانی بەرگی دووەمی کتێبی (مرۆڤ و دەوروبەر)م کڕی و بردمەوە ماڵ لە ئۆردوگای گردەچاڵ لە هەولێر، کە ئەوکات ئێمەی خەڵکی هەڵەبجەیان دوای گەڕانەوەمان لە ئێران لێ نیشتەجێ کرد و دەستم دایە بیخوێنمەوە.

پاڵنەرم بۆ کڕینی ئەو کتێبە فەلسەفییە لەو تەمەنی سەرەتای گەنجێتییەدا بەپلەی یەکەم بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە هەر لە سەرەتای هۆش کرانەوەمدا حەزم لە خوێندنەوەی بابەتە فیکرییەکان و بەتایبەت ئەو کتێبانە بوو کە ململانێی فیکرییان تێدا بوو بۆ نموونە لە نێوان ئیمان و ئیلحاد، لە نێوان ئیسلام و مەسیحیەت، لەنێوان ئیسلام و کۆمیۆنیزم و ناسیونالیزم و سەرمایەداری (کاپیتالیزم).

ڕاستیەکەی کە دەستم بە خوێندنەوەی ئەو کتێبە کرد هیچی لێ تێنەگەیشتم، هەر هیچ، ئەوەندە وشك و ئاڵۆز هاتە بەرچاوم باس ناکرێ، ئەوەندە تێدەگەیشتم کە باسی کرێکار و جوتیار و چەپ و ئەو شتانە دەکات، ئیتر چی دەڵێ تەقەی سەرم دەهات، چەندە لاپەڕەکانم دەگۆڕی بەڵکو لەجێیەکدا دەروازەیەك بۆ تێگەیشتنی بدۆزمەوە بێ سوود بوو. وازم لێ هێنا، بگرە خەفەتم بۆ ئەو چەند دینارەش خوارد کە لەو بارودۆخە دژوارەی ئەو کاتەدا بە کڕینی ئەو کتێبە لە کیسم چوو.

ساڵی کۆتایی خوێندنم بوو لە پەیمانگای تەکنیکیی کەرکوك لەرێی چەند برادەرێکەوە کە لە خانوودا پێکەوە بووین هەندێ لەو کتێبە فیکرییانەم دەست کەوت کە لە ڕوانگەی ئیسلامییەوە بەرپەرچی ڕێبازە فیکرییە خۆرئاواییەکانیان دەدایەوە وەك مارکسیزم و سەرمایەداری، لەوانە بەتایبەت کتێبەکانی محەمەد قوتب وەك (معركة التقاليد) و (شبهات حول الاسلام) و (جاهلية قرن العشرين) (التطور و الثبات في حياة البشر) و (الانسان بين المادية والاسلام)، هەروەها هەندێ لە کتێبەکانی فەتحی

یەكن. بەحوكمی حەزە بنەڕەتیەكەی خۆم بۆ خوێندنەوەی بابەتە جەدەلیەكان بە تامەزرۆوە ئەو كتێبانەم دەخوێندەوە(ئەڵبەت كتێبەكان نهێنی و قاچاخ بوون و پێمانەوە بگیرایە كارمان تەواو بوو).

لەو كتێبانە سەرەتایەك لە بنەماكانی فەلسەفەی ماتریالیزم و فیكری ماركسی تێگەیشتم وەك مادیەتی جەدەلی و مادیەتی مێژوویی و ململانێی چینایەتی و حەتمیەتی مێژوویی و مێژووی چینەكان و تێڕوانینی ماركسیزم بۆ ئاین و حاڵەتە رۆحیەكان و مەسەلەی ژێرخان و سەرخان و دەوری ئابووری لە گۆڕانی كۆمەڵایەتی و مێژوودا و دیكتاتۆریەتی پرۆلیتاریا و... هتد.

تا ئەمەم كرد لە گردەچاڵ ئازاد كراین و دواتر راپەرین و كۆڕەوی بەسەردا هات.

كاتێ لە ئێرانەوە گەڕاینەوە هەڵەبجە و بوارێك بۆ خوێندنەوە رەخسایەوە جارێكیتر چوومەوە سەر (مرۆڤ و دەوروبەر)ەكەی مەسعود محەمەد، بەڵام ئەم جارەیان، لەگەڵ ئەوەی كتێبێكە كە ٢٠٠ لاپەڕەیە و بەیەك نەفەس و بەبێ هیچ ناونیشانێكی لاوەكی یان دابەشكردنێك نووسراوە، تەواو پێچەوانەی جاری پێشوو نەك هەر زۆر بەئاسانی تێی گەیشتم، بگرە زۆرم پێ سەیر بوو كە بۆچی جاران لێی تینەدەگەیشتم، بەڵام راستیەكەی لەگەڵ خوێندنەوەی رەنگە زێدەڕۆیی نەكەم ئەگەر بڵێم عاشقی كتێبەكە بووم، چونكە ئەو وردەكاری و قووڵی و بەهرە و مەوزوعیەت و مەوسوعیەت و جوانیەی لەو كتیبەدا نیم لە هیچكام لەو كتێبانەدا نەمدیبوو كە پێشتر لە مەسەلە فیكریەكانی پەیوەست بەو بابەتەوە خوێندبونمەوە. لەگەڵ خوێندنەوەیدا هەستم دەكرد لەگەڵ خۆی توانا و ئاسۆی بیركردنەوە منیش زیاتر و فراوانتر دەكات، بگرە لە ناواخنی بەرهەمێكی فیكریی و فەلسەفیدا جگە لە لایەنە شیكاری و تەئەمولییەكە، تەنانەت لە رووی زانیاریی گشتیشەوە زەخیرەیەكی دەوڵەمەندی لە زانیاری مێژوویی و فەلسەفی و زانستی پێ دەبەخشیت.

خوێندنەوەی ئەو كتێبە خستمیە كەڵكەڵەی پەیداكردنی بەرگی یەكەمیشی كە پێم وابوو لەوەی دووەم بنچینەییتر و گرنگترە، چونكە سەرەداوی بابەتەكان

لەوێوە دەستیان پێ کردوە. سەرەنجام پەیدام کرد و خوێندمەوە، بەدوای ئەوەدا زۆرێکیتر لە کتێبەکانیم پەیدا کرد و خوێندنمەوە و ئەو کتێبانە بوون بە یەکێ لە بەنرخترین و سەرنجراکێشترین ئەو کتێبە فیکرییانەی لەو چەند ساڵەدا خوێندنمەوە. بەبەردەوامیش هەست دەکەم بۆچوونەکانی مەسعود محەمەد زیندوون و لە گەرمەی ململانێ فیکری و سیاسییەکانی نەوە نوێکانیشدا دەکەنەوە دەدرەوشێنەوە و بایەخیان دەردەکەوێ.

لەو کاتەوە هەستم دەکرد مەسعود محەمەد بیرمەندێکی هەڵکەوتووە و دەبوو میللەتی ئێمە کە لە رووی فیکری و رۆشنبیرییەوە بەرماوەخۆری بەرماوەخۆرەکانین ئەم پیاوە و بەرهەمە نایابەکانی بەشێوەیەکی شایستە بنرخێنین، چونکە مەسعود محەمەد لەنێو میللەت و ناوەندێکی رۆشنبیریی لاسایکەرەوە و بەرماوەخۆری ئەم و ئەودا ئازادانە و بەپشت بەستن بە توانا رۆحی و زەینیەکانی خۆی بیری کردۆتەوە و داهێنانی کردوە و فیکری بەرهەم هێناوە، قسەی ئەم و ئەوی نەجویوەتەوە. بەڵام ئاگاداریی خوێندەواران بەتایبەت نەوەی نوێ لە فیکری ئەو زۆر کەمە.

**** **** ****

هەڵکەوتوویی مەسعود محەمەد شتێك نیە شاراوە بێ ، بەڵام کەم نین ئەوانەی هەوڵ دەدەن ئەو تەنیا لە رووی زمانزانیەوە بە داهێنەر و لێهاتوو دابنێن و لە بایەخی نووسینە فیکرییەکانی کەم دەکەنەوە (چەند حاڵەتێکی لەو جۆرەم دیوە)، هاوکات کەمیش نین ئەوانەی نرخی دەزانن.

هەژار موکریانی لەبارەیەوە وتویەتی "لە هەموو کوردستان و لە هەموو جیهانیشدا کەس وەك مەسعود محەمەدد نانوسێ، کەسێ قەڵەمی ئەوی نیە، ئەو کوردییەی ئەو دەینووسێ دەتاقەتی کەسدا نیە"(١).

خوسرەو جاف دەڵێ "من پێم وایە ئەوانەی لە دەرەوە خەڵاتی نۆبڵ وەردەگرن لە مەسعود محەمەد زیاتریان یان پێ نیە"(٢).

فەرهاد پیربال لەبارەوە دەڵێ "مەسعود محەمەد تاکە فەیلەسوفی کوردە و تاقە نووسەریشە توانیبێتی فەلسەفە بە زمانی کوردی بنوسێ و لەناو دەفری زمانی کوردیدا بیگونجێنێت".

کەمال مەزهەر وتویەتی " مەسعود محەمەد هیچی لە بەرنادشۆ کەمتر نەبووە .. لە زاراوە بژێری و زمانی عەرەبیدا کەس نەبووە شان لە شانی بدات.. هەر بوارێکی هەڵبژاردایە شۆڕەسواری مەیدان بوو"(٣)

*** *** ***

## پێگه‌ی مه‌سعود محه‌مه‌د

من پاش خوێندنه‌وه‌ی ئه‌وه‌ی پێدا گه‌یشتووم له نووسینه فیكرییه‌كانی مه‌سعود محه‌مه‌د –كه ره‌نگه به‌شی هه‌ره‌زۆری نوسینه فیكرییه‌كانی بێ– له‌و باوه‌ڕه‌دام ئه‌وانه‌ی سه‌ره‌وه له‌و هه‌ڵسه‌نگاندنه‌یاندا زیاده‌ڕه‌وییه‌كی ئه‌وتۆیان نه‌كردبێ به‌تایبه‌ت ئه‌گه‌ر باس له بازنه كوردییه‌كه بكرێ. به بڕوای به‌نده نووسینه‌كانی مه‌سعود محه‌مه‌د ئه‌وه ده‌هێنن له ریزی به‌رهه‌مه‌كانی گه‌روه بیریاران و نووسه‌رانی دنیادا دایان بنێین، به‌ڵام ئێمه‌ی كورد، به‌وته‌ی نه‌جمه‌دینی مه‌لا "زیندوكوژی مردوو په‌رستین" و وا راهاتووین هه‌ڵكه‌وتوانمان تا له ژیاندان پشتگوێیان ده‌خه‌ین و بارته‌قای كۆشش و خزمه‌ت و داهێنانه‌كانیان گرنگییان پێ ناده‌ین تا له‌م دنیایه كۆچ ده‌كه‌ن ئه‌وكاته ده‌كه‌وینه پیاهه‌ڵدانیان و كۆڕ و كۆبوونه‌وه و فیستیڤاڵیان بۆ ساز ده‌كه‌ین.

بیروڕاكانی مه‌سعود محه‌مه‌د له بواری لێكدانه‌وه‌ی زاتییه‌ت و باری ده‌روونی و كۆمه‌ڵایه‌تیی مرۆڤ و راڤه‌كردنی مێژوو و گۆڕانی كۆمه‌ڵایه‌تیدا، هیچیان له بیروڕاكانی نووسه‌رانی ناوداری جیهان كه‌متر نییه كه خوێنده‌وار و رۆشنبیرانمان ئالووده و تامه‌زرۆی به‌دواداگه‌ڕان و خوێندنه‌وه و بانگه‌شه بۆ كردنیانن، بگره به بڕوای به‌نده نووسینه‌كانی ئه‌م به‌حوكمی ئه‌وه‌ی فیكرێكی ته‌واو كوردییه كه عه‌قڵێكی كوردیی شاره‌زا له واقیعه كوردییه‌كه و به‌هه‌ست و نه‌ست و بۆن و به‌رامه‌ی كوردی و له كاسه‌ی زمانی كوردیدا به‌رهه‌م هاتووه و فیكرێكی له‌قوتونراوی له‌ده‌ره‌وه هێنراو نییه، ئه‌و تایبه‌تمه‌ندییه‌شی هه‌یه كه له تێگه‌یشتنی خوێنده‌واری كورده‌وه نزیكتره، به‌پێچه‌وانه‌ی بیروڕا و تیۆر و لێكدانه‌وه‌كانی بیرمه‌نده بیانییه‌كان و هه‌وادار و لاساییكه‌ره‌وه خۆماڵییه‌كانیان، كه به‌رهه‌مه‌كانیان به‌زۆری مۆركی كێشه و گرفت و بۆن و به‌ها تایبه‌ته‌كانی كۆمه‌ڵگه‌كانی خۆیانی به‌سه‌ره‌وه زاڵه و به‌زه‌حمه‌تتر وێنه‌یان له زه‌ینی كوردیدا ده‌چه‌سپن.

ئه‌وه‌ی به‌لای منه‌وه وه‌ك خوێنه‌رێكی به‌رده‌وامی نووسینه‌كانی مه‌سعود محه‌مه‌د جێی سه‌رنج بووه ئه‌وه‌یه ئه‌و بۆچوون و لێكدانه‌وه‌ی پێشكه‌شیان ده‌كات

بەرەنجامی وردبوونەوە و رامان و لێکدانەوەی زیرەکانەی خۆیەتی لە مەسەلەکانی مرۆڤ و بوون و مێژوو و کۆمەڵایەتی و سروشتی شتەکان و ئەو شێوە نووسین و لێکۆڵینەوەیەی وەلا خستووە کە بۆ دیراسەکردن و هەڵسەنگاندن و رەخنەلێگرتنی فیکرەیەك یان بۆچوونێك پەنا بۆ کۆکردنەوەی بۆچوونی ئەم و ئەو دەبات، تەنانەت لە شێوە و قاڵبی نووسینیشدا لە قاڵبە باوەکەی لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی دەرچووە کە لێکۆڵینەوە بۆ پیشەکی و چەند بەش و سەردێر و ناونیشانێکی سەرەکی و لاوەکی و ئەنجامگیریی کۆتایی دابەش دەکات، بەڵکو لەبری ئەوە کتێبەکانی بەزۆری لە سەرەتاوە تا کۆتایی یەك هەناسەن و هیچ پۆلێکردنێکی بابەتی و سەردێڕ و ناونیشانگەلیکی تێدا نییەن کە رەنگە ئەو شێوە نووسینە بەلای زۆرێك لە خوێنەرانەوە قورس بێ.

نووسەر وێڕای ئەم توانا داهێنەرانەیە و ئەو خزمەتە بەرفراوانەی لەبوارەکانی فیکر و ئەدەب و زمان و رۆشنبیریدا پێشکەشی کردوە، کەچی وەك پێویست لەلایەن رۆشنبیران و خوێندەوارانی کوردەوە بایەخ بە نووسینەکانی نەدراوە و قسەیان لەسەر نەکراوە و هەوڵ نەدراوە خوێندەواران بە بەرهەم و بۆچوونەکانی ئاشنا بکرێن.

رەنگە بەرزیی ئاستیی زمان و داڕشتنی مەسعود محەمەد و ئەو وردبوونەوە و چڕبوونەوە فیکرییەی لە لێکدانەوە و شرۆڤەکردنی بابەتە فیکری و فەلسەفی و سیاسیەکاندا بەخەرجی داوە بەلای خوێندەواری ئاساییەوە هۆکارێك بێ بۆ تەنگەتاو بوون و درێژەنەدان بە خوێندنەوەی نووسینەکانی، بەڵام پێم وایە لەناو هۆکارەکاندا دوو هۆی سەرەکی رۆڵی بەرچاویان هەبووە لەوەی وەك پێویست بایەخ بە بەرهەمەکانی نەدراوە:

١– نووسەر سەر بە ئایدیۆلۆژیا و لایەنێکی سیاسیی تایبەت نەبووە کە کار بۆ رەواج پێدانی بیرۆکەکانی بکات وەك بەشێك لە گوتاری فیکری و سیاسیی ئەو لایەنە، بەڵکو، وەك خۆی باسی دەکات، وەك رۆشنبیرێکی ئەنتی–ئایدیۆلۆژی کاری کردوە و بەزۆریش بەپێچەوانەی ئاراستە و بەرژەوەدیی رۆشنبیریی زاڵ بەسەر گۆڕەپانی

رۆشنبیریی ئەو کاتەی کوردستان، کە رۆشنبیریی چەپ بووە، کاری کردوە. ئەمە وای کردوە بەرهەمەکانی بەجۆرێك لە جۆرەکان لاتەریك بکرێن.

٢- تا ئێستاش جۆرێك لە خۆپەرستی و چاو هەڵنەهاتن بە داهێنانی یەکتر بەسەر ناوەندە رۆشنبیری و کەلتورییەکەی کوردستاندا زاڵە و رۆشنبیرانمان نەگەیشتوونەتە ئەو ئاستە لە سینەپاکی و هۆشیاری کە بە پێگەیشتن و درەوشانەوەی ئەستێرەی بەختی یەکتر بگەشێنەوە و ئێرەیی سەردڵیان نەگرێت و پێشکەوتنی ئەویدی بە بێبایەخبوون و پەراوێزکەوتنی خۆی نەزانێ، کە رەنگە یەکێ لە هۆکارەکانی بایەخ پێنەدانی مەسعود محەمەدیش وەك پێویست بۆ ئەم دەردە رۆحییە بگەڕێتەوە، عەرەبیش وتوێتی "كل ذي نعمة محسود" واتە هەموو خواپێداوێك ئێرەیی پێ براوە.

ئەگەرچی پاش هەرەسی بلۆکی سۆشیالیستیی رۆژهەلاتی ئەورووپا لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی رابردوودا و رەوینەوەی دەسەلاتی بێهاوشانی رۆشنبیری مارکسیزمی بەسەر گۆڕەپانی رۆشنبیریی کوردستاندا نووسینە فیکرییەکنی مەسعود محەمەد، کە بەزۆری هەڵسەنگاندن و رەخنەلێگرتنی تیۆری ماتریالیزمی مێژوویی و بۆچوون و سیاسەتەکانی حزب و دەسەلاتەکانی سەر بەو قوتابخانەیەیە، ئەو گەرم و گوڕی و سەرنجراکێشیەی جارانی لای خوێندەوارانی نەوەکانی دواتر نییە وەك ئەوکاتەی رۆشنبیران لەگەڵ ململانێی رۆشنبیریی چەپدا دەستەویەخە بوون، بەلام لەبەرچەند هۆکارێك هێشتا بەرهەمە فیکرییەکانی نووسەر بایەخ و سەنگی خۆیان هەر ماوە و ناوەندی رۆشنبیریی کوردی لێیان بێنیاز نیە، لەوانە:

١- تەفسیری ماتریالیزمی بۆ مێژوو گەرچی ئەزموونی شکستخواردووی حەفتا ساڵەی حوکمی دەوڵەتە شیوعی و سۆشیالیستیەکان تووشی بێمتمانەیی و بێباخبوونێکی گەردوونی کردووە، بەلام لەگەڵ ئەمەشدا هێشتا وەك تیۆرێکی فیکری و فەلسەفی

هەر ماوە و دوا هەناسەی نەداوە و ئەگەری چالاكبوونەوەی لـە دەورەيـەكی نـوێی مێژوويدا بە دوور نازانرێ، چونكە فيكر وەك شتە زيندووەكانيتری دنيا دەچێتەوميەك و ناوودەنگی كز دەبێ، بەڵام بەتەواوی نامرێ و رەنگە لە وەرزێكيتری مێژووييدا بە سيمايەكی نوێوە دەركەوێتەوە، بەتايبەت كـە دەزانـين تـەمـەنی ماتريـاليزم زۆر لـە ماترياليزمی مێژوويی و ماترياليزمی ديالەكتيك و فەلسەفەی ماركسيزم كۆنترە، وەك دەزانين تائێستەيش ماكسيزم هەوادارانی خۆی لە جيهاندا هەيە.

٢- بۆچوونی نووسەر لەبارەی تەفسيری مێژوو و گۆڕانی كۆمەڵايەتی كە خۆی ناوی راڤەی مرۆيی بۆ مێژوو ياخود "تەفسيری بەشەريی بۆ مێژوو"ی لێ ناوە تـەرحێكی ورد و قووڵە و خاوەن سيما تايبەتی خۆيەتی و بايەخ و چارەنووسی نەبەستراوە بە چارەنووس و مان يان نەمانی ئەو فەلسەفەيەوە كە لە بنەڕەتدا مەسـعود محەمـەد تيۆرەكەی لەبەرامبەر ئەو گەڵاڵە كردوە، بۆيە ئەو نەزەرەی نووسەر بايەخی خـۆی دەپارێزێ و قابيل بەوەيە بخوێنرێتەوە و بە ديدی نوێ و لەژێر رۆشنايی تێگەيشتنی نوێ لە ياساكانی پەيوەنديية كۆمەڵايەتييەكان هەڵبسەنگێنرێتەوە.

٣- ئاماژەكانی نووسەر بۆ ريشەداری و كاريگەری و پێويستيی ئاين و لايەنی رۆحی بۆ مرۆڤ تا ئەو رۆژەی ململانێ لەنێوان ئاين و فەلسەفە دژەئاينی و ماترياليزميەكانا هەبێ بايەخی خۆيـان دەمـێنێ (گـەر لـە دامـێنی بيروڕای بەهێزتريـشدا بـن)، ديـارە ئێستايش كە ماترياليزمی ماركسی پاشەكشەی كردوە ماتريـاليزمی ديكـە هـەن لـە جيهانـدا كـە لـەرووی فەلـسەفييەوە بـەجۆرێك لـەجۆرەكان هـەمان تێڕوانينيـان لـە بەرامبەر ئاينەكان هەيە. ئەڵبەت ئـەم خاڵـەيان زيـاتر بـەلای ئاينپەروەرانـەوە جێـی گرنگی و بايەخە.

٤- هەندێ لە بۆچوونەكانی نووسەر لەمەڕ رۆڵی ئيجابيانەی ئاين و ئيـسلامەتی لـە كۆمەڵگەی كوردەواری و لـە بـواری هێنانەكايـەی بـەهاكانی يەكسانی و دادگـەريی كۆمەڵايەتيدا، لەناو هەڵوێستی زۆربەی رۆشنبيرانی سەر بە نەوەی ئەودا، كەخاوەن

جیهانبینییەکی لائیکی و چەپ بوون بۆ بوون و ژیان و ئەخلاق و کۆمەڵایەتی، ئەگەر هەڵوێستێکی تاقانە نەبێ کەم وێنەیە.

لێرەوە بە گرنگم زانی بۆچوون و کۆمێنتە پەرش و بڵاوە پێوەندیدارەکانی بە ئاین و بابەتە رۆحی و ئاینیەکان لە بەرهەمە فیکرییەکانی نووسەر بکەمە بابەتی لێکۆڵینەوەیەك بێئەوەی مەبەستم بێت بەوە نووسەر وەك بیرمەندێکی دژ یان لایەنگری بیری ئاینی نیشان بدەم، چونکە نووسەر خۆی لە زۆر شوێنی نووسینەکانیدا جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە خۆی بەشوێنکەوتەی ئایدیۆلۆژیایەك دانانێ و قەتیش بە کەسێکی نەوتوە فلانە رێگە بگرە بەر، بەڵام ئەمە رێگر نیە لەوەی خوێنەران و توێژەران و رەخنەگران بە قووڵایی بۆچوونەکانیدا بچنە خوارێ و رۆحیەتێکی تێدا بدۆزنەوە کە رەنگە نووسەر خۆیشی نکوڵی لەوە بکات پەیامێکی لەو جۆرەی لە دووتوێی دەقەکانیدا هەڵگرتوە.

دەق دوای ئەوەی بڵاو بوویەوە ئیدی موڵکی خوێنەرە و مافی ئەوەی هەیە خوێندنەوەی خۆی بۆ ئەو دەقە بکات بەبێ ئەوەی نەیاریی نووسەری دەقەکە بۆئەو جۆرە تێگەیشتن و خوێندنەوەیە ببێتە پاساوێکی لۆژیکی بۆ بێبایەخبوونی ئەو خوێندنەوەیە.

راستیەکەی لە سەردانێکدا بۆ لای نووسەر لەساڵی ١٩٩٧ کاتێك پێم وت من کتێبێکم نووسیوە لەبارەی ئاین لە فیکری جەنابتدا، بەسەر سوڕمانەوە گوتی "جا من چیم لەبارەی ئاین وتوە تا کتێبی لەسەر بنوسرێ؟!".

رەنگە مامۆستا مەسعود محەمەد وا تێگەیشتبێ کە من ئەوم وا نیشان داوە کە بەتایبەتی لەسەری ئاینی نووسیوە، بەرگری لێکردوە یان لەدژی قسەی کردوە، بەڵام من ئەوەم نەکردوە، ئەوەی کردوومە تەنیا کۆکردنەوەی دەقە پێوەندیدارەکانی نووسەرە بە بابەتە ئاینیەکانەوە و دۆزینەوەی ئەو جومگە هاوبەشانەیە کە ئەو سەرەداوانە بەیەکەوە دەبەستنەوە. لێرەوەیە هەوڵم داوە دەقەکان وەك خۆیان لە چەند تەوەرەیەکدا بخەمە روو بەبێ ئەوەی واتا و مەبەستێك لە دەرەوەی دەقەکانەوە بۆ سەلماندنی بۆچوون و قەناعەت باوەڕێکی تایبەتیی خۆم بەسەر ئەو

دەقانەدا بسەپێنم، یان بۆچوونی خۆم لەبارەی ئەوەی نووسەر وتویێتی، جا بە سەلب ب یان بە ئیجاب، دەبڕم.

دەشێ لێرە یان لەوێ لەگەڵ بۆچوونەکانی ئەو جیاواز بم، بەڵام ئەو جیاوازییەم تیکەڵی ئەم بابەتە نەکردوە و هەوڵم داوە، بەپێی توانا، کارم تەنیا ڕێکخستن و خستنەرووی بۆچوونەکانی نووسەر بێ لەو بوارەی دیاری کراوە.

لە کۆتایی ئەم پێشەکییەدا بەپێویستی دەزانم ئەوە بڵێم کە ئەم بابەتە وەك لێکۆڵینەوەیەك لە ژمارە (٧)ی سەنتەری (برایەتی)دا لە ئابی ١٩٩٨ بڵاو کراوەتەوە، کەئەوکاتە هێشتا مامۆستا مەسعود محەمەد لەژیاندا بوو. بەڵام دوای تیپەڕینی ئەو چەند ساڵە و ئەو (انطباع)ەی لە ئەنجامی دیدارێك لەگەڵ نووسەر و دواتریش کۆچی دوایی لە ٢٠٠٢/٤/١دا و دوای ئەوەی برایانی پرۆژەی تیشك بۆرە قەولێکیان پیدام کە بابەتەکەم بۆ چاپ بکەن بە چاویکی رەخنەگرانە بە بابەتەکەدا چوومەوە وئەولایەنە سۆزباوییەی لە هەندێ هەڵبژاردنی هەندێ ئەو وشە و دەستەواژە و دەربڕینانەی لە ئەنجامی جۆرێك لە سۆزباوییەوە خۆیان بەسەر بابەتەکەدا سەپاندبوو دەسکاریم کردن بەشێوەیەك لە خزمەتی بابەتیبوونی بابەتەکەدا بێت. هەروەها هەندێ روونکردنەوە کە بەپێویستم زانیوە زیادم کردووە، ئەو ئەنجامگیریەش لە کۆتایی بابەتە بڵاو کراوەکەدا هەبوو بە زیادم زانی و لامدا.

مەسعود محەمەد لە نووسینێکیدا لەبارەی شێوازی خۆی لە مامەلەکردن لەگەڵ وشەی بیانی دەڵێ "خۆم لە بەکارهینانی وشەی بێگانە نەپاراستوە ئەگەر زانیبێتم باشتر مەبەست دەگەیەنێ"، لێرەوە دەبینی ژمارەیەکی زۆر وشەی عەرەبی لە دەقەکانیدا بەکاردێنی وەك (مولتەزیم، مەفهوم، سەقافەت، مەعلوم، تەئسیر، ئەسەر، لزوم... هتد) لەبەرئەوە و بۆ پاراستنی ئەمانەتی وەرگرتن وشەکانی نووسەرم وەك خۆیان گواستۆتەوە، بەلام لە هەندێ شوێندا رێنووسەکەیم لە رەنووسی ئێستەی نووسینی کوردی نزیك کردۆتەوە.

**** **** ****

## تایبه‌تمه‌ندێتیی فیکری نووسه‌ر

خوێنه‌ر له ئه‌نجامی خوێندنه‌وه‌ی نووسینه فیکرییه‌کانی مه‌سعود محه‌مه‌د دا ئه‌وه‌ی به‌روونی بۆ ده‌رده‌که‌وێ که نووسه‌ر خۆی به‌فیکر و ئایدیۆلۆژیا و قه‌ناعه‌ت و باوه‌ڕێکی پێشوه‌خت چه‌سپاوه‌وه گرێ نه‌داوه که، وه‌ك نووسه‌رانی شوێنکه‌وته‌ی ئایدیۆلۆژیا جۆراوجۆره‌کان، هه‌وڵ و ته‌قه‌لاکانی بۆ پشت ئه‌ستوورکردنی ئه‌و باوه‌ڕ یاخود فیکره ته‌رخان بکات، به‌ڵکو وه‌ك رۆشنبیرێکی خاوه‌ن بیرکردنه‌وه و ئاراسته و شێوازی فیکریی سه‌ربه‌خۆ و دوور له ئاراسته و کارتێکردنی تاقمێکی ئایدیۆلۆژیی تایبه‌ت دێته‌پێش چاو، که ئاراسته‌ی بیر و قه‌ناعه‌ت و هه‌ستی سپاردووه به ئاراسته‌ی ئه‌و شنه‌بایه‌ی که پاش بیرکردنه‌وه و لێکدانه‌وه و توێژینه‌وه‌ی خۆی ده‌گاته ئه‌و باوه‌ڕه‌ی که له‌لای حه‌قیقه‌ته‌وه هه‌ڵیکردوه.

نووسه ر به‌پشتبه‌ستن به رامان و لێکۆڵینه‌وه و هه‌ڵسه‌نگاندنی خۆی، خۆی بۆ به‌گژاچوونه‌وه‌ی ئه‌و بیر و باوه‌ڕ و قه‌ناعه‌ت و سیاسه‌تانه ته‌رخان کردوه که له‌لایه‌ن هه‌ر رێره‌وێکی فه‌لسه‌فی و سیاسی و ئاینی و کۆمه‌ڵایه‌تی یان ده‌سته و تاقمێکی حزبی و رێکخراوه‌ییه‌وه پشتگیری ده‌کرێن و، به‌لای نووسه‌ره‌وه له‌گه‌ڵ حه‌قیقه‌تی رووتدا لێك ده‌ده‌ن، به‌تایبه‌ت فه‌له‌سه‌فه‌ی ماتریالیزمی مێژوویی، که به‌گوته‌ی نووسه‌ر بۆ ماوه‌ی پتر له چل ساڵ باڵی به‌سه‌ر گۆڕه‌پانی رۆشنبیری و سیاسیی کوردستاندا کێشابوو، که نووسه‌ر به‌شی هه‌ره‌زۆری کۆششه فیکرییه‌کانی بۆ شیته‌ڵکردن و ره‌خنه‌لێگرتنی بنه‌ما و بۆچوون و پێوه‌ره‌کانی ئه‌و تیۆره و سیاسه‌ت و هه‌ڵوێسته‌کانی حزبه کوردییه‌کانی سه‌ر به‌و قوتابخانه فیکرییه ته‌رخان کردووه.

نووسه‌ر له‌باره‌ی هه‌ڵوێستی له پابه‌ندبوون و ملکه‌چکردنی مرۆڤ بۆ ئایدیۆلۆژیا و باوه‌ڕێکی تایبه‌ت و خۆگونجاندن له‌گه‌ڵ بنه‌ما فیکری و سلوکییه‌کانیدا و خۆنه‌بانکردن له‌هه‌ر ده‌نگ و ره‌خنه‌یه‌کی نه‌یار به‌و ئایدیۆلۆژیایه، ده‌ڵێ "به‌لای منه‌وه ئاده‌میزاد له هه‌موو فه‌لسه‌فه و باوه‌ڕێك به‌نرختر و به‌شه‌ره‌فتره... له‌و تاریکستانه ره‌شتر و ئه‌نگوسته‌چاوتر نیه که مرۆڤ وه‌ك به‌رخ رام بکرێ بۆ کاوێژکردنی تاکه یه‌ك باوه‌ڕ، تفاندنه‌وه و هێنانه‌وه‌ی هه‌رچی باوه‌ڕێکیتر هه‌یه غه‌یری ئه‌و".(١)

بۆچوونەکانی زادەی بیرکردنەوە ولێکدانەوە و رامانی خۆیەتی لە دیاردە و حاڵەتە فیکری و سایکۆلۆژی و سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان، هەمیشە ئەوە دووپات دەکاتەوە کە ئەوەی دەینوسی گوزارشت لە قەناعەتی تایبەت و ئازادانەی خۆی دەکات و بۆ قبوڵکردن یان رەتکردنەوەی بیروبۆچوونێك چاوەڕێی بڕیار وحەزی کەس و تاقمێك ناکات، هەر بۆیە ئامادەیە هەر کات لەئەنجامی تێفکرین و توێژینەوە پووچەڵیی باوەڕ و قەناعەتێکی بۆ دەرکەوت بەبێ دوودڵی لێی پاشگەزببێتەوە ئەگەرچی بۆ ماوەیەکی زۆریش بەرگری لێ کردبێ، لەم بارەیەوە دەڵێ "قەناعەتی من وەك قەناعەتی هەر کەسێکی زاڵ بەسەر دڵ و مێشك و دەست و زمانی خۆیدا لەناخی دڵ و دەروون و لەئاکامی لێکدانەوە و لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی سەربەخۆ و ئازادی خاوەنەکەی پەیدا بووە، هەر بۆیەشە ئیمکان هەیە ئەوەی بەئازادی قەناعەتی لەدڵی خۆیدا پەیدا کردوە بەئاسانی واز لە هەڵەی خۆی بهێنێت، چونکە کە حەقیقەتی لێ روون بۆوە چاوەنۆڕی رازیبوون و رالێبوونی دەسەڵاتی سەرەوەی خۆی ناکات بۆ ئەوەی بڕوا بکات بە رەوابوونی گۆڕینی قەناعەت... چەند بەئاسانی لەتینوەتیدا ئاو دەخۆمەوە هەروەهاش بەئاسانی واز لەو باوەڕەم دەهێنم کە بەبەڵگە دەپووچێتەوە با بە هەمو عومریشم رێزم لێ گرتبێ".

بۆیە ئامۆگاری خوێندەواران و رۆشنبیرانی کورد دەکات کە بیری خۆیان لە بۆتەی ئایدیۆلۆژیایەکی داخراودا لەقاڵب نەدەن و هەستی رەخنەگرانەیان نەکوژن بەڵکو لەهەموو بارەکاندا بیروهۆشیان بخەنە کار و سڵ لە رەخنەگرتن نەکەنەوە و دەڵێ "من یەکەم ئامۆژگاریم بۆ رۆشنبیری تازە پێگەیشتووی کورد ئەوەیە خۆی نەکاتە پاسەوانی فکرەی قاڵب بەستوو... چاوی رەخنەی نەنوقێنێ، هەردەم ئامادەی رەفز بێت، بەمەرجێك سەرلەنوێ نەبێتەو بە پاسەوانی رەفز"(٢).

نووسەر هێندە لە ئاکامی پابەندبوونی ئایدیۆلۆژی و خۆگرێدانی ناهۆشیارانە بە قەناعەت و باوەڕە چەسپیوەکانی ئایدیۆلۆژا، هەر ئایدیۆلۆژیایەك بێ، دەترسێ تەنانەت سڵ لەوەش دەکات خوێنەرانی بانگ بکات بۆ باوەڕهێنان بەو بۆچوونانەیش کە خۆی لەرێی رامان و لێکدانەوەکانیەوە راستییان دەسەلمێنێ و خۆی گوتەی

پووچـەڵیی درۆیـەکی پەرەسـەندوویان پـێ دەردەخـات، چـونکە لـەوە ترسـاوە باوەڕهێنان بەو قەناعەتە سەلماوانە لە ئایندەدا لای ئەو خوێنەرانەی باوەڕیـان پـێ دێنن ببێتە باوەڕێکی قاڵب بەستوو و شـوورەیەکی پـیرۆزی بـەدەوردا بکێشرێ کـە بـواری سـەرلەنوێ چـاوپێداگێڕانەوە و لەمەحـەکی عـەقڵ دان و هەڵـسەنگاندنەوەی نەدرێ لەکاتێکدا بیروبۆچوونەکان چـەندە تۆکمـە و تـەواو و پـڕ بێنـە بەرچـاو، لـە مەودایـەکی دوور یـاخود نێزیکـدا گۆشـەنیگا و سـیاقێکیتر بـۆ خوێندنـەوە و رەخنەلێگرتنیان دەدۆزرێتەوە.

- بۆ نموونە لە هەردوو بەرگی یەکەم و دووەمی کتێبی (مرۆڤ و دەورویەر)دا لـە زۆر جێگـە و بۆنـەدا بەڵگـەی کـۆنکرێتی و واقیعـی لەسـەر ریشەداریی هەسـتی ئاینپـەروەری و بـاوەڕداریی لـە سروشـتی مرۆڤـدا و، کاریگـەریی بـەها و بـاوەڕە غەیبییەکان لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیی گەلان و بزوتنەوەی مێژوودا دێنێتەوە و دەیکاتـە نیـشانەی گومـان و پرسـیار لەسـەر تیـۆری ماتریـالیزمی مێـژوویی و ماتریالیزمی دیالەکتیك، کـە ئاینیـان بـە دەیاردەیـەکی کۆمەڵایـەتیی نائاسمـانی و، زادەی عـەقڵ و دەرهاویـشتەی پێداویـستییە ئـابوری و کۆمەڵایەتیـەکانی چـاخە دێرینەکانی مێژووی مرۆڤایەتی و، بەرەنجامی بـاری دواکـەوتویی و سـەرەتاییبوونی ئاستی هۆشیاریی کۆمەڵگە بەراییەکانی مێژووی مرۆڤایەتی و، بە تلیـاگی گـەلان و چەکی دەستی چەوسێنەران و، لە هەموو بارەکاندا بـە سـەرخانی ژیـانی ئـابووری، لەقەڵەم دەدا.

نووسەر لەگەڵ ئەوەی لە بەرگی یەکـەمی کتێبـی (حـاجی قـادری کـۆی)دا بێباکیی خۆی لە نووسینێك نیشان داوە کە بیروراکانی ئەوی لە بەرگی یەکەمی هەمان کتێبدا بە (میتافیزیکی) داناوە و دەڵێ "وەسفی میتافیزیکی ئەو پیاو تۆقێنەرە نییە کە وەها بە راشکاوی لە مرۆڤ ببێتە عەیب"، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا کەچی هێشتا خۆی بە لایەنگری ئاین بڕیار نەداوە و ئامادە نەبووە بانگەواز بۆ ئەو قەناعەتەی بکات کە بە چەندین بەڵگە پشتیوانی لێ دەکات، بگرە بەپێچەوانەوە لە چەندین جێدا دوای بەڵگەهێنانەوەکان ئەوە دووپات دەکاتەوە کە ئەو مەبەستی لەو قسانە بانگەوازکردن

نییە بۆ ئەو باوەڕە و نایەوێ بەوە کابرای مادی بکاتە خوداپەرست، وەك دەڵێ "..
لێرەدا هەرگیز مەبەستم ئەوە نیە بڵێم بیرکەرەوەی مادی واز لە باوەڕەکەی خۆی
بهێنێت و ببێتە خودا پەرست"(٣). یان دەڵێ "یەك پیت لە نووکی خامەی منەوە
نەچۆتە سەر کاغەز و ویستبێتی خەتیك لەنێوان مادە و غەیب رابکێشێت و
فەلسەفەی مادی بۆ خاتری ئاین وە یا هەر جۆرە بیرکردنەوەیەکی میسالی و غەیبی
بێ، بپووچێنێتەوە"(٤). "من لەم قسانەدا ناڵێم ئەو باوەڕەی یەکێکی پاکستانی بۆ
سەر مەرقەدی گەیلانی رادەکێشێت ئاخۆ راستە یا چەوتە، من تەنها دیاردەکە
بەرووی خوێنەردا دەدەمەوە لەگەڵ هەندێ پرسیاری دوودڵانە و گومانکارانە بۆ
ئەوەی پەلە نەکات"(٥) ".. لەم قسەیەمدا مەبەستم نییە لەجیاتی پیاوی ئاینی
بەڵگەی هۆشەکی(عەقڵی) بۆ عیلمی خوا پەیدا بکەم، داواش لە مولحید ناکەم ئیمان
بەبوونی خوا بهێنێت"(٦)، "من مەبەستم نیە لێرەدا داوا لە خوێنەر بکەم موسڵمان
بێت و رۆژی جزمێکی قورئان بخوێنێتەوە، تەنها مەبەستێکم هەبێ ئەوەیە کە لایەنی
زاتیبوونی مرۆڤ بهێنمە بەرچاوانەوە"(٧) "هەڵبەتە من لێرەدا مەبەستم ئەوە نیە
مولحیدان بکەمە ئیماندار.."(٨)، "لەوەتەی هەم بەکەسم نەگوتوە فلانە رێگە
بگرەبەر.."(٩).

نووسەر لە هەموو ئەو کتێبانەیدا کە بیروبۆچوونەکانی لەبارەی تەفسیری
مێژوو و کۆمەڵایەتی تێیاندا بڵاو کردوەتەوە بەپلەی یەکەم جەختی کردۆتە سەر
هەوڵدان بۆ پووچاندنەوەی بیروبۆچوونەکانی ماتریالیزمی مێژوویی لە راڤەکردنی
مێژوودا و رەخنەگرتن لە هەڵوێستەکانی رۆشنبیران و حزبە کوردییەکانی سەر بەو
قوتابخانە فەلسەفییە، ئەمیش لەو روانگەیەوە بووە کە هەستی کردوە زاڵبوونی ئەو
فەلسەفەیە بەسەر زەین و هۆش و هەستی بەشی هەرەزۆری خوێندەوارانی کورد لە
سی ساڵی دوای جەنگی جیهانیی دووەمدا، وای کردوە ئەو فەلسەفەیە بیری
رۆشنبیری کورد بەرەو لەقاڵبدان ببات و دەرگای ئاگاداربوون لە هەر فیکرە و
فەلسەفەیەکی دی لێ دابخات.

نوسەر دەڵێ "سی ساڵ پترە (لە حەفتاکانی سەدەی رابردوودا بووە) خوێندەواری کورد هەرچی فیکرەیەکی دەرەوەی جوغزی ماتریالیزم هەیە لێی حەرلم کراوە.." بەشێوەیەك "..هیچ موبالەغە لەوەدا نیە کە دەڵێم دیتومە مەلای کورد لەنێو ئەڵقەی تازە خوێندەواری کورد نەیوێراوە بەرەهایی هەموو باوەڕێکی ئاینیی راست و دروست و بێ تەئویلی ئیسلامەتی باس بکات وەیان بەدەنگی دلێرەوە بڵێ بنەما ئابورییەکانی ئیسلام لە کۆمیۆنیزم باشترە"(١٠).

وێڕای ئەوەی-وەك باس کرا- بەشی زۆری کۆششە فیکرییەکانی لە مەیانی گفتوگۆ لەگەڵ ماتریالیزمدا بەخەرج داوە، بەلام لەپەنا ئەو بابەتە سەرەکیەشدا رەخنەی لە فیکرە و هەڵوێستی لایەنگرانی فەلسەفە و ئاین و باوەڕیدیکەیش گرتووە کە ئەو هەڵوێستانە بەلای نووسەرەوە لە خزمەتی مرۆڤدا نەبوون، وەك دیاردەی توندوتیژیی ئەو دیندارە نەخوێندەوار و سادانەی بەناوی جیاوازیی مەزهەب و دینەوە کاری بێبەزەییانە دەکەن، یان وەك هەڵوێست ئەو جەزبەگرتوانەی بەبێ لێکدانەوە و بیرکردنەوەی خۆیان عیسمەت و غەیبزانی وەپاڵ رێبەرە رۆحیەکانیان دەدەن.

بەکورتی نووسەر -خۆی وتەنی- هەمیشە ئامادەی رەخنە و رەفزکردنی ئەو تەرح و بیروبۆچوون و رەفتارانەیە کە بەلایەوە جێی رەخنەن. بەڵام وەك سروشتی زۆرێك لە رەخنەگران کە بەدیلێك بۆ ئەو شتانەی رەخنەیان لێدەگرن پێشکەش ناکەن، نووسەریش رەخنە لە زۆر فیکرە و گوفتار و رەفتاری مەزهەب و ئایدیۆلۆژیا و گرووپەکان دەگرێ بەبێ ئەوەی شان بەشانی رەخنەکان، بەدیل و چارەسەرێکی روون بخاتە بەردەم خوێنەران بۆ هەڵبژاردنی رێگەیەکی تر جیا لەوەی لە واقیعەکەدا هەیە و نووسەر بە دروستی نازانێ.

دیارە نووسەر ئەم رەخنەی رووبەڕوو کراوەتەوە، ئەویش بەوە وەڵامی دەداتەوە کە "مەرج نیە لەسەر ئەو کەسەی هەڵە لە شتێکدا دەدۆزێتەوە باری راستی شتەکەش بدۆزێتەوە، چونکە رەنگە راستیی شتەکە بەند بێ بە سەرەدەریکردن لە گەلێك ماك و پێکهێنەر و پێوەندی و دەروبەر و ئاو و هەواوە کە لە توانای بابایەکی

که‌م توانای وه‌ك مندا نه‌بێ وه‌یا له من به‌ده‌سه‌لاتتریش نه‌بێ، من ده‌زانم (٥٣٩٦٨٢١*٢٣٧٩٥٤٧) ناکاته (١٥٠٠) به‌لام مه‌رج نیه بزانم ده‌کاته چه‌ند... به‌ر له ٢٥٠٠ ساڵ که ده‌یانزانی زه‌وی خڕه نه‌یانده‌زانی بۆچی ئاوی ده‌ریاکان ناڕژێته بۆشایی، چونکه جارێ نیوتن ده‌ستووری کێشه‌ری نه‌دۆزیبۆوه، ئاسماناناسیش له پله‌ی سه‌ره‌تاییدا بوو"(١١)

نووسه‌ر به‌وه ویژدانی خۆی ده‌حه‌وێنێته‌وه که هه‌ڵه‌کانی ناو فیکره‌یه‌ك ده‌ستنیشان بکات و خوێنه‌ریان لێ به‌ئاگا بێنێ، له‌وه به‌دوا دان به‌بێتوانایی خۆیدا که مه‌رج نیه که‌ره‌سته‌ی فیکری و مه‌عریفی ئه‌وتۆی له‌ده‌ستدا بێ که بتوانێ داڕشته‌یه‌کی نوێ له‌جێی پێشنیار بکات

**** **** ****

## جێی ئاین لە فەلسەفەی (ئەنتی-ئایدیۆلۆژیا)ی نووسەردا

مەسعود محەمەد خۆی وەك رۆشنبیرێکی نائایدیۆلۆژی دەناسێنێ و ناوبەناویش بێ ئایدیۆلۆژیایی خۆی و بانگەوازنەکردنی بۆ هەر فیکرە و ئاین و رێبازێك دووپات دەکاتەوە.

بەڵام ئەگەر چاو لەو خۆبەریکردنە راستەوخۆیانەی نووسەر خۆی سەبارەت بە ئایدیۆلۆژیا بپۆشین و لە خوێندنەوەی هەر برگە و بابەتێکی نووسینەکانیدا نەیکەینە سەنگی مەحەك و تەنیا دەلالەتی گوتەکان لەسیاقی خۆیاندا بخوێنینەوە و بەو دیدەوە رووپێوێکی وردی ئەو گوتانە بکەین کە لە ئاین بەگشتی و ئاینی ئیسلام بەتایبەتی دەدوێن و نووسەر وەك دید و تێگەیشتنی خۆی دەربڕیون، ئەو هەستە لەلای خوێنەر دەبزوێ کە نووسەر ئاین بە دیاردەیەکی ریشەدار و کاریگەر لە بوون و ژیاندا دەبینێ.

راستە نووسەر لە زۆرێك لەو جێیانەدا کە ئاماژە بۆ کاریگەریی ئاین دەکات لەسەر تاك و کۆمەڵ و باری رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و ژیاری، مەبەستی ئەوە بووە واقیع خۆی چۆنە وا ببینرێ و بخوێنرێتەوە و لەپێناو خزمەتکردنی ئایدیۆلۆژیایەکی تایبەتدا راستیەکانی واقیع و مێژوو ئاوەژوو نەکرێن (وەك لە باسکردنی کوردایەتیکردنی ئیبنو ئادەم و هەستی چینایەتیی حاجی قادری کۆییدا لێی دەدوێ) نەك وەك ئاماژەیەکی ئامانجدار بۆ خزمەتکردن بە ئاین، بەلام قەناعەتی ناوەکیی نووسەر بە توانا ئیجابیەکانی ئیسلامەتی لە بزواندنی هەستی مرۆڤدۆستی و نەتەوەپەروەری و گیانی بزاوتن و شۆرشگێڕی و بەگژاچوونەوەی ستەم لای پیاوانێکی وەك مەلای ئیبنو ئادەم و حاجی قادری کۆیی و دادخوازێکی وەك عومەری کوری خەتاب و هاوبەشیخوازێکی وەك ئەبو زەری غەفاری و قارەمانێکی رزگاریخوازی وەك سەلاحەدینی ئەیوبی و...هتد دەکرێ ئەوەی لێ بخوێنرێتەوە کە ناکرێ ئەو کاریگەرییانە کاری لە هەستی مەسعود محەمەد نەکردبێ.

بەلگەهێنانەوەکانی نووسەر لە بۆنە و بابەت وشێوازی جۆراوجۆردا لەسەر حەقیقەتی هەستی ئاینیی مرۆڤ و، رەخنەکانی لە ماتریالیزمی مێژوویی لەرووی

فەرامۆشکردن و بێبایەخ سەیرکردنی لایەنی مەعنەویی مرۆڤ لە کێشانە و پێوانـە و حساب بۆ کردن لە گۆڕینی بـاری کۆمەڵایـەتی و بزوتنـەوەی مێـژوودا، بەڵگەیـەکی ناراستەخۆن لەسەر ئەوەی کە باوەڕ بە غەیبیات و مەعنەویات (کە بناغەی ئاینیان لەسەر دامەزراوە) هێڵێکە لە هێڵە پێکهێنەرەکانی فیکری مەسعود محەمەد.

گەر وا نەبێت و باوەر بە غەیب و ماکە رۆحی و مەعنەوییـەکانی مـرۆڤ لـە فیکـری نووسـەر دەرهاوێـژین چـۆن دەتـوانین تەفسیری رەخنـەکانی لـە تەفـسیری ماتریالیزمی مێژوویی بۆ گۆڕانی کۆمەڵایەتی بکـەین و، کامەیـە ئـەو کەلێنـەی لـەو تەفسیرەدا هەیە گەر ئەو کەلێنە چاوپۆشینی نەبێ لە دەوری ئیرادەی ئازادی مرۆڤ و رەهەندە رۆحییەکانی مرۆڤایەتی لە نەخشاندنی بـاری کۆمەڵایـەتی و پەرەسـەندنی مێژوودا؟.

دەتوانین گرنگترین ئادگارە ئاینییەکان لە فیکری مەسعود محەمـەد دا لـەم چەند تەوەرەی خوارەوەدا نیشان بدەین:

## یەکەم: تەفسیری بەشەریی بۆ مێژوو:

مەسعود محەمەد لە سەراپای نووسینە فیکرییەکانیدا جەخت لەسەر ئـەوە دەکات کە مرۆڤ وەك کائینێکی خاوەن گیان و هۆش و ئیرادە یەکەم و سەرەکیترین هۆکـارە لـە گـۆڕانی کۆمەڵایـەتی و ئـابوری و ئاراسـتەکردنی مێـژوو و پێـشکەوتنی هۆیەکان و پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان و، سەرکەوتن و ژێرکەوتنی ئاین و ئایدیۆلۆژیا و ژیارەکاندا، نەك وەك تەفسیری ماتریالیزمی پێی وایە، مـادەی بێگیـان و هـۆش و دەروبـەر و گـۆڕانی زاتیـی هۆیـەکانی بەرهـەمهێنان بکـەری کاریگـەر بـن و مـرۆڤ کارتێکراوێکی لە ئیرادە داماڵراو بێ.

ئەم تێڕوانینەی خۆیشی لە راڤەکردنی مێژووودا بە "تەفسیری بەشەریی بـۆ مێژوو" ناو بردوە و لەکتێبێکی سەربەخۆیشدا بەناوی "وجهة نظر في التفسير البشري للتاريخ" بەتایبەتی لەسەر ئەو تەفسیرە وەستاوە و شی کردوەتەوە.

وەك نووسەر باسی دەكات ئەو تیۆرە تایبەتەی لە راڤەی مێژوودا بەرهەمی چەندین ساڵ رامان و وردبوونەوە و شەونخونیكردن لەبیركردنەوەی نەفەس درێژانە بووە لە مەسەلەكانی مرۆڤ و ژیان و مێژوو و، بەراوردكردنی وێنەكانی واقیع لەگەڵ ئەو بۆچوونانەی تەفسیری باری كۆمەلایەتی و جوڵەی مێژوویان پێ كراوە.

لەبارەی ئەو ساتانەی بە رامان لـەو مەسـەلە وجودییانـەدا بردونیەتەسـەر مەسعود محەمەد دەڵێ "من پاش پلەی حقوق ... وردە وردە خۆم تەسلیمی مەیلە بنەڕەتییەكەی تێفكرین و وردبوونەوە و بەراوردكردن و پێكگرتن كرد، شەونخونیم لە زستاندا وەها دەبوو هەتا دوای شەبەقی بەیانی دەوامی دەكرد، نانی سبەینەم لەگەڵ هی نوەڕۆ یەكدییان دەگرتەوە"، دواتردەڵێ "حەفت زستانی نێوان ١٩٤٥ و ١٩٥٢ بۆ من بووە قاڵبێك كە بنیادەمی تێدا دادەڕشترێت: بنەمای بیروباوەڕ و قەناعەتی دوارۆژم بەرانبەر زۆرینەی پرسیارە بنەڕەتییەكانی مرۆڤ وروژێن لە شەوانی ئەو زستانانەدا گەلاڵە كران"(١٢).

یەكێ لەو خالانەی لە شێوازی بەرهەمە فیكرییەكانی مەسعود محەمەد بەلای منەوە جێی سەرنج و پەسەندكردنە ئەوەیە ئەوەی لەو چەند دێڕەی سەرەوە باسی كرد لە وردبوونەوە و تێڕامانی قووڵ و نەفەس درێژ لە بابەتە فەلسەفیەكانی بوون و ژیان بەئاشكرا لە بەرهەمەكانیدا دیارە، خوێنـەر هەسـت دەكـات كۆشـشە فیكرییـە سەختەكانی نووسەر بـەروونیی لـە شـیكاركردن و و بەڵگـەكاری و لێكدانەوەكانیـدا رەنگـی داوەتـەوە و، قـسە و بۆچـوون و بەڵگەكارییـەكانی جوینـەوەی بۆچـوون و بەڵگەكانی كەسانیدی نین وەك لە زۆر نووسین و لێكۆڵینەوەدا دەیبینین.

لێرەوەیە نووسینەكانی زیاتر داهێنانی خودین و سەرچاوە و پـەراوێز یـان لێوەرگرتن(اقتباس)یان تێدا زۆر كەمە. ئەو هەوڵی داوە هەر لە شیكردنەوەی خودی دەق و بۆچوون و تیۆر و دروشمە ئایدیۆلۆژیەكاندا ناسازی و ناتەواوی بدۆزێتـەوە و بیكاتە بەڵگە لەسەری، لەم بارەوە خۆی دەنووسێ "بەرنامەوی من ئەوەیە هەتا بۆم بلوێ بەڵگەی راستی نەبونی باوەڕێك رەخنەی لێدەگرم لە بەڵگەنامەی ئەو باوەرەوە هەڵێنجم، ئینجا بێمە سەر هەڵێنجانی بەڵگە لە رووداو و لە تەجرەبە كە شتێك بەدۆر

دهخهنهوه.."(١٣)، ههروهها له جێیهکیتردا دهڵێ "دهگمهن نهبووه که ههر له موناقهشهکردنی بهڵگهی سهلماندن بهڵگهی پوچاندنهوهم دۆزیوهتهوه بێ ئهوهی پشت به هیچ بهڵگهیهك ببهستم له دهرهوهی دهقهکه".

ئهم شێوازهی نووسهر له شیکردنهوه و ههڵسهنگاندنی فیکره و باوهڕهکاندا وای کردووه جۆرێك له تایبهتمهندی و نوێگهرییهك له تهرحهکانیدا ههست بکرێ که له بهرههمهکانی زۆرێك لهو دانراوانهیتردا ههست پێناکرێ که لهو باس و بابهتانهی نووسهر لێیان دواوه دواون، بهتایبهت باس و بابهتهکانی پهیوهست به فهلسهفهی ماتریالیزمی دیالهکتیك و ماتریالیزمی مێژوویی و سیاسهتی حزب و دهسهڵاتهکانی سهر بهو قوتابخانهیه.

نووسهر پێی وایه مرۆڤ کاریگهری یهکهمه له دیاریکردنی ئاراستهی مێژوو، ههرچی هۆیهکانی بهرههمهێنانه له قۆناغه مێژووییه جیاجیاکاندا له دهرهنجامی کۆتاییدا بهرههمی بیر و کار و کۆششی مرۆڤن و بۆ خزمهتی خۆی دایهێناون، ههر ئهویش پێشیان دهخات و یاسای نوێ بۆ کهڵك لێوهرگرتنیان دادهڕێژێ. لهم بارهیهوه دهڵێ "من له دهمێکهوه بۆ ئهوه چووم که مرۆڤ نهك هۆیهکانی مادی و ئابوری کۆڵهکهی مێژووه، ههر بهویش شی دهکرێتهوه. دهبێ مرۆڤ بهرهو پێش بچێت ئینجا هۆی بهرههمهێنانی پیش بیهخێت بهپێچهوانهی دهقی تهقلیدی که دهڵێ بهگۆڕانی هۆی بهرههم کۆمهڵایهتی دهگۆڕێت.."(١٤).

له درێژهی شیکردنهوهی بۆچوونهکهیدا دهڵێ "بێ مرۆڤ ئهوی چالاکی (طبيعي)ی مادهی مردوو و زیندووی رووهك وئاژهڵ ههیه له سروشتدا پهیدا نابێ، که مرۆڤ نهبێ ههرچی دهریا و کێوه بهرزهکان و بیابانهکان و فرتهنهکان و رۆژو مانگ و ئهستێرهکان ههیه ناتوانێ یهك تهقهڵ له پینهی پێڵاوێك بدات، پێڵاو نابێ تا پینه بکرێ، پینه نابێ تهقهڵی لێ بدرێ... فیکرهی تهقهڵیش له فهرههنگی زانستدا وجودی نابێ"(١٥).

نووسهر پێی وایه ئهوهی پێی دهوترێ پهرهسهندنی مێژوو شتێك نییه جیا له مرۆڤ و لهراستیدا ههر بریتیه له پهرهسهندنی خودی مرۆڤ و له کار و رووداوهکاندا

بەچاك یان بەخراپ خۆی دەنوێنێ، هۆیەكانی بەرهەمێنان بەرجەستەبوونی زیرەكیی مرۆڤن و بەبێ مرۆڤ شتێك نابێ بەناوی هۆیەكانی بەرهەمێنان و پێشكەوتن و گۆڕانی مێژوو "لەراستیدا پەرەسەندنی مێژوو هەر پەرەسەندنی مرۆڤە كە لە داهێنانە چاك و بێ بایەخەكانیدا خۆی دەنوێنێ، ئەو كاتەی چوارچێوەی درك و توانای فراوان دەبێ یاخود تەسك دەبێ و دادەبەزێ، ئاسەوارەكەی لە ئەندامەكانی لەشیدا بەدیار ناكەوێ... بەڵكو لە كار و پەرستن و بەرهەم و راستی و درۆ و زانستەكان و هونەرەكان و جەنگ و ئازادی و كۆیلایەتی و شێوەی خواردن و جۆری پۆشاك و كەلەپوور و ناشتنی مردوو و شایی و زەماوەند و هەر كردن و نەكردنێكیدا خۆ دەنوێنێ... هۆیەكانی بەرهەمهێنان لە غەیبەوە بۆی دانەبەزیون، لەخۆشیانەوە پەرەیان نەسەندووە و سنووری تێگەیشتن و ئیرادەی مرۆڤیشیان تێ نەپەڕاندوە، ئەوانە یەكێ لە نیشانەكانی زیرەكیی مرۆڤن" (١٦)

ئەڵبەت شتێكی ئاساییە كە مەبەستی نووسەر لەم قسانە ئەوە نەبێ كە مادە و دەوروبەر و باری ئابوری بێ كاریگەری بن لەسەر مرۆڤ و مێژوو، بەڵكو مەبەستی ئەوەیە مرۆڤ یەكەم و سەرەكیترین هۆكارە و ناكرێ هۆكارە مادیەكان هێندە كارگەرایەتییان پێ بدرێ كە سەربكێشێ بۆ ئەوەی مرۆڤ وەك بوونەوەرێكی دەست و پێ بەستراو لەبەردەم ئەو هۆكارانە و گۆڕانی دەوروبەردا بخرێتە روو، لەم بارەوە دەڵێ "من هیچ لاریم نیە لە گرنگی و بایەخی مادە و دەروبەر و هەڵكەوت و رووداو و... هتد لە ژیانی مرۆڤ و بەرەوپێش چوونی كۆمەڵایەتی و بزوتنەوەی مێژوو وهەموو ئەو لایەنانەی پێوەندییان بە مرۆڤەوە هەیە، دەمەوێ لەهەمان كاتدا بڕوای بێسنوور و لەحەد بەدەر بە مادە و كاریگەرایەتیی مادە نەكێشێتەوە سەر درزینەوەی كاریگەرایەتی و خالقییەتی (مرۆڤ) بۆ مادە، كە دەزانین مرۆڤ سەرەڕی مادەبوونی لەش و ئەندامەكانی، گیان و هۆش و ئیرادەشی هەیە كە ئەمانە لە مادەی مردوو و دەروبەری شەختەكردوودا پەیدا نین"(١٧) هەروەها بەستنەوەی گۆڕانكارییەكانی مێژوو بە مادەوە و بێنرخكردنی رۆڵی مرۆڤ بەجۆرێك لە "بتپەرستی نوێ" دەچوێنێ "لە سەردەمی كۆندا بەراشكاوی مادەی مردوو لە شێوەی بتدا لەلایەن مرۆڤەوە

دەپەرسترا بائێمە شتێکی وەها نەکەین لەرێی فەلسەفەوە سەرلەنوێ مرۆڤ بکەینەوە بە بتەپرستێکی مۆدێلی سەدەی بیستەم"(١٨).

نووسەر پێی وایە رۆڵی مرۆڤ و مادەو دەوروبەر لە دروستکردنی گۆڕانکارییەکاندا تەواوکارییە، نە مرۆڤ بەتەنیا و لە بۆشایدا دەتوانێ بیربکاتەوە وکار بکات و عەقڵ و باری کۆمەڵایەتی پێش بخات و مێژوو بجوڵێنێ، نە مادە ودەوروبەر و سروشتیش بەبێ بوون و وەستایی مرۆڤ دەتوانن بەردێ لەسەر بەردێکیدی دانێن، چونکە هاوکێشەکانی ژیانی فیکری و کۆمەڵایەتی بەکارلێککردنی دووسەرەی عەقڵ و تواناکانی مرۆڤ لەگەڵ کەرەستە و ئامادەییەکانی سروشت دێنە پێکهاتن.

لەم بارەیەوە نووسەر دەڵێ "بەخەیاڵ یەکێك لە تاریکستانی ئەودیو کاکێشان خەلق بکە، هەڵبەت ناتوانێ شیعر هەڵبەستێ و گۆرانی بڵێ و بیر لە تەڵاق کەوتن بکاتەوە... هەروەك لە بەتاڵاییدا هۆش (واتە مرۆڤ) کار ناکات، بەبێ هۆشیش (مەبەستی لە هۆش عەقڵە–عومەر) هەرچی سروشت هەیە بە ئەزەل و ئەبەدیەوە وبە دەستوورات و هێزە نهێنییەکانیەوە ناتوانن یەك خاڵ بنوسن، یەك وشە بڵێن، یەك هەڵپەرکێ رێك بخەن، هەموو ئەو شتانەی پەکیان لەسەر هۆش کەوتووە بەبێ بوونی ئەو پەیدا نابن، سروشت لە هەموویاندا بێ دەسەڵاتە نەك هەر بەو مانایەی کە ناتوانێ بیانکات، بگرە لەشێوەی هێزەکی (وجود بالقوە)یشدا وێنەی مەوهومی ئەو شتانە لەسروشتدا پەیدا نابێ"(١٩).

بۆیە نووسەر بەجۆرێك لە گاڵتەئامێزییەوە رەخنە لەو بیروڕا مادیانە دەگرێ کە پێیان وایە "هەروەك ئاوێنە شکڵی واقیع دەداتەوە بێ ئەوەی تێیبگات وە یا بتوانێ شکڵەکەی نەداتەوە، هەروەها دەبێ مرۆڤ بەسازی دەوروبەری هەڵپەڕێ بێ ئەوەی بتوانێ هەڵنەپەڕێ، ئەمە قەناعەتی بیریاری مادییە لەبارەی بیروڕا مادییەکانی خۆیەوە کە گۆیا وەك گڵۆپ تیشکی بەتاریکاییدا بڵاو دەبێتەوە"(٢٠).

لێرەوە کار لەسەر ئەوە دەکات بیسەلمێنێ مرۆڤ بوونەوەرێکی خاوەن عەقڵ و ئیرادە و توانای بڕیاردانە، زاتییەت تێیدا ریشەدارە و هەر ئەو زاتییەتەیش ، نەك دەوروبەری مادی(مەوزوع)، ئاراستە و هەڵوێستی مرۆڤ دیاری دەکات، دەرووبەر

ناتوانێ باز بەسەر ئیرادەی زاتدا بدات مەگەر زات خۆی بەشێوەیەك لەشێوەكان بڕیار بدات مل بۆ فشارەكانی بابەت واتە دەوروبەر كەچ بكات. مرۆڤ دەتوانێ لە حاڵەتەكان و هەلكەوت و هەلۆیستەكان و روداوەكان رامێنێ و تێیان بگات، ئینجا بڕیار دەدات كام هەلۆیستە هەلبژێرێ و چی بكات، تەنانەت لەحاڵەتێكیشدا كە مرۆڤ لەژێر فشاری هەڕەشە و چاوسووركردنەوەدا پێچەوانەی ویست و حەزلێبوونی خۆی دەجولێتەوە هێشتا هەر ئیرادەیە كە خاوەن بڕیارە و هەر ئەوە بڕیار دەدات مل بۆ هەڕەشە كەچ بكات، ئەگینا دەتوانێ تەحەدای بارودۆخە سەختەكە بكات و ملی بۆ كەچ نەكات ئەگەرچی لەو پێناوەدا گیانیشی ببەخشێ، چەندین نموونەی فیداكاری لەو شێوە لە مێژووی میلەتاندا تۆمار كراوە.

لەم بارەیەوە مەسعود محەمەد دەڵێ "مرۆڤ لە رۆژی لەدایكبوونەوە بوونەوەریكی زاتییە، هەرچی بابەت و مادە و مەوزوعی جیهان هەیە ناتوان مرۆڤ ببزوێنن ئەگەر تێیان نەگات، كە تێشیان گەیشت بەپیریانەوە ناچێت ئەگەر بڕوا بەسوودیان نەكات، بڕواش بە سوودیان بكات خەریكی دەردەستكردنیان نابێت ئەگەر توانای نەبێت وەیا لێی نەگەڕێن وەیا عەقیدە رێی پێنەدات. خولاسە هەتا بەدوای خوردكردنەوەی چالاكی مرۆڤ بكەویت بۆت روونتر دەبێتەوە كەوا مرۆڤ چەند زاتییە و چۆن مەوزوعییەتەكەیشی هەر بە بۆتەی زاتەكەیدا تێدەپەڕێت ئینجا دەبێتە هاندەر".

دواتر بەنموونە دەڵێ "لەگەلێك باردا ئازادیی ئیرادە تێدەچێت وەك كە هەڕەشە لێكردن بەكار بهێنرێت، وەیا بەپارە دڵ و دەروون بكڕدرێت، وەیا بە فەندی جادووگەرانە دڵ و دەروونەكە خەفە بكرێت، لەو تەرزە حاڵەتانەدا زاتییەتی مرۆڤزۆر كز دەبێتەوە، بەلام هەر دەمێنێ و هەر خۆی بڕیار دەدا سەر بۆ هەڕەشە دانەوێنێت و یا بەپارە خۆی بفرۆشێت. مرۆڤی واش هەیە لەو حاڵەتانەدا زاڵ دەبێ بەسەر ترسی هەڕەشەدا و دەشكوژرێ، بەلام واز لە باوەڕی ناهێنێت... دیارە ئەو تەرزە مرۆڤە باوەڕی خۆی بە هەموو دنیا ناگۆڕێتەوە، تەنانەت كە نادروستیی باوەڕی خۆشی دۆزیەوە شەرم دەیگرێ وازی لێ بهێنێت. لەم حاڵەتانەدا زات دەگاتە ئەوپەڕی زاڵبوون بەسەر بابەتدا".(٢١)

هەروەها بەردەوام دەبیٚ لە وردکردنەوەی تیۆرەکەی و دەڵیٚ "من ئەگەر جیهان حساب بکەم بە تەختەدامە و مرۆڤیش بەدامەچی دابنیٚم، بەوەدا سەلماندوومە کە بەبیٚ تەختەکە و بەردەکان یاری دامە ناکریٚ. ئەوەی من زیاد لە بیریارە مادییەکان دەیڵیٚم ئەوەیە کە تەختەدامە لەخۆوە و بەدڵخوازی خۆی مرۆڤ ناچار ناکات بە یاریکردن. لەو تەشبیهەیشدا (تەشبیهی جیهان بە تەختەدامە) ئاگادارم کە مرۆڤ جیهانی دروست نەکردوە وەك کە تەختەدامەی دروست کردوە"(٢٢)

نووسەر بۆ سەلماندنی رۆڵی زاتییەت و ئیرادەی مرۆڤ لەئاست ئەو حەتمیەتەی ماتریالیزمی میژوویی وەپالٚ رەوتی میٚژوو و پەرەسەندنی هۆکارەکانی بەرهەمهیٚنانی دەدات و، پیٚی وایە گۆڕانی هۆکارەکانی بەرهەمهیٚنان خۆبەخۆ و بەدەر لە ئیرادەی مرۆڤ و کۆمەڵگە، گۆڕان لە رەوتی میٚژوو و سیستمی فیکری و رۆحی و کۆمەڵایەتی و سیاسیدا دروست دەکات، ئاماژە بە هەڵویٚست و سیاسەتی کردەیی دەسەڵاتە کۆمیۆنیست و سۆشیالیتەکانی دنیا دەکات کە بە کردەوە بەپیٚی ئەو فەلسەفەیەی بانگەشەی بۆ دەکەن ناجوڵیٚنەوە و گۆڕانی کۆمەڵگە بە چەرخی میٚژوو ناسپیٚرن، بەڵکو بە زەبری هیٚز دەست دەخەنە نیٚو واقیعەوە تا بەپیٚی ویست و حەزی خۆیان، نەك بەو شیٚوەیەی سروشتی گۆڕان و پەرەسەندنی میٚژوو(حەتمیەتی میٚژوویی) دەیخوازیٚ، دایبڕیٚژنەوە، نووسەر دەڵیٚ "(ئەوان) لە سەرەتای فەلسەفەکەیانەوە گوتویانە: بە فەرمانی میٚژوو هەموو بیروڕا و بزوتنەوەیەکی غەیری مارکسی پیٚ بە پیٚ دەبیٚ لەناو بچیٚ کەچی "لەو وڵاتانەی بەرەی کۆمیۆنیست تیٚیدا دەسەڵات وەردەگرن هەرگیز پاراستنی خۆیان تەسلیم بە (بڕیاری میٚژوو و حەتمییەتی چارەسەرکردنی سۆشیالیست ناکەن) بەپیٚچەوانەوە وەها خۆیان پڕچەك دەکەن و حزبایەتی دەچەسپیٚنن و غەیری خۆیان کەنەفت دەکەن هەر دەڵیٚی بڕیاری میٚژوو دژی خۆیان دەرچووە" بۆیە دەڵیٚ "ئەگەر راستە گۆڕانی حەتمیی میٚژوویی، جیهان بەرەو کۆمیۆنیزم دەبات با ئەوانیش وەك دەوڵەتیٚکی کەم دەسەڵاتی وەك دانیمارك و سویسرە نەختیٚك ریٚگە بەو حەتمییەتە بدەن لەخۆوە و بیٚ بگرە ببەستە باڵ بەسەر میللەتدا بهینیٚت" (٢٣).

لێره‌وه‌یه نووسه‌ر جه‌خت له‌سه‌ر ئه‌وه ده‌کات که نابێ لێکدانه‌وه‌ی مێژوو ته‌نها له چوارچێوه‌ی شیته‌ڵکردنی زیهنی و فیکریی رووت و دوور له تێپه‌ڕاندنی به‌تێو سروشتی واقیع و ژیان به‌ڕێوه بچن، چونکه تیۆری کۆمه‌ڵایه‌تی بۆ راڤه و ئاراسته‌کردنی واقیعه و ده‌بێ ناسینی سروشتی ئه‌و واقیعه سه‌نگی مه‌حه‌ك و بناغه‌ی داڕشتنی یاساکان بێ، ئه‌گینا تیۆر شتێ ده‌ڵێ و تیۆریسته‌کان و شوێنکه‌وتوانی تیۆره‌که به‌شێوه‌یه‌کیتر ده‌جوڵێنه‌وه و ده‌بنه دوو جیهانی ته‌واو لێك جودا، که هه‌ر یه‌که‌یان به‌پێی یاسا و به‌رنامه‌یه‌کی جیا له‌ویتر کاری خۆی رێك ده‌خات "ئێمه ده‌بێ فیکر به‌ناو هه‌ڵکه‌وت و رووداو و هه‌ڵوێستدا بگێڕین بۆ ئه‌وه‌ی یه‌کتر یه‌کالا بکه‌نه‌وه، ئیتر یا فیکره‌که راست ده‌رده‌چێت و چه‌وتی شته مادییه‌کان ده‌رده‌خات یا به‌پێچه‌وانه‌وه... دابڕینی فیکر له واقیع که‌ڵك له فیکره‌که ده‌بڕێ و وای لێده‌کات بچێته ریزی دامه و شه‌تره‌نج که زانین و نه‌زانینی له سنووری خۆیدا ده‌مێنێته‌وه و هچ شتان به‌ئیسپات ناگه‌یه‌نێت و هیچ تاریکیان رووناك ناکاته‌وه و هیچ درۆیان سپی ناکاته‌وه... هه‌ر هیچ ناکات"(٢٤).

نووسه‌ر وردبینانه و به نه‌فه‌سێکی فه‌لسه‌فیی قووڵه‌وه له‌سه‌ر ئه‌وبۆچوونه‌ی ماتریالیزمی مێژوویی ده‌وه‌ستێ و ره‌خنه‌ی لێ ده‌گرێ که پێی وایه مرۆڤ ئاوێنه‌ی ده‌روبه‌ره مادییه‌که‌یه‌تی، یاخود هۆیه‌کانی به‌رهه‌مهێنان و بارودۆخی ئابوری بناغه و ژێرخانی کۆمه‌ڵایه‌تین و له‌مانه‌وه جۆری سه‌رخانی کۆمه‌ڵایه‌تی، که به‌پێی ئه‌و ته‌فسیره لایه‌نه رۆحی و که‌لتووری و ئیبداعیه‌کانی وه‌ك ئاین و ئه‌ده‌ب و یاسا و ره‌وشت و سیاسه‌ت و هونه‌ر و فیکر ده‌گرێته‌وه، ده‌گۆڕێت و هه‌میشه سه‌رخان به‌رهه‌م و ره‌نگدانه‌وه‌ی ژێرخانه که ئابووریه، له‌م باره‌یه‌وه مه‌سعود محه‌مه‌د ده‌ڵێ "ئه‌م گوته‌یه –مه‌به‌ستی ئه‌و جۆره راڤه‌یه– گۆڕانی هۆی به‌رهه‌مهێنان له‌غه‌یبه‌وه ده‌هێنێت و خۆی ماندوو ناکات به دۆزینه‌وه‌ی ئه‌و ماکانه‌ی هۆیه‌که‌ی ده‌گۆڕن، که بگوترێ (که به‌هار هات گوڵ ده‌پشکوێ و دنیا گه‌رم دادێت) بێ ئه‌وه‌ی گوته‌که به‌هار بگێڕێته‌وه بۆ نزیکبوونه‌وه‌ی رۆژ و ره‌وانه‌وه‌ی سه‌رمای زستان، له‌م حاڵه‌ته‌دا قسه‌که ده‌بێته باسی هێزی ون و میتافیزیك، چونکه به‌بێ هۆی کاریگه‌ر به‌هار دانایه‌ت...

به‌هار له‌خۆوه‌ نايه‌ت، كه‌ رۆژيش هۆی هاتن نه‌بووبێ ديارە دەبێ لەو بەينەدا نهێنيەك كاری خۆی كردبێت، هه‌روه‌هاش گۆڕانی هۆی به‌رهه‌مهێنان كه‌ نه‌زانين سه‌به‌بی گۆڕانه‌كه‌ی چييه‌ ديارە به‌ديار ميتافيزيكه‌وه‌ ده‌بێ بحه‌په‌سێين"(٢٥).

له‌ جێيه‌كيتردا له‌سه‌ر هه‌مان لێكدانه‌وه‌ی ماترياليزمی ده‌ڵێ "هه‌ڵبه‌ت ئه‌م ته‌رزه‌ هه‌وڵدانه‌ داوا ده‌كات راسته‌وخۆ و به‌ر له‌ هه‌موو شتێك مرۆڤ و ده‌وره‌كه‌ی و زاته‌كه‌ی و قه‌ناعه‌ته‌كه‌ی و حه‌زه‌كه‌ی و قابيلييه‌ته‌ زگماكه‌ خالقه‌كه‌ی بێ ته‌ره‌ف و لاته‌ريك بكه‌يت تاكو جه‌نابی گاسن و كرمی ئاوريشم و تۆڕی ماسی گرتن و داس و مشار و چه‌كوچ و ئاشی ئاو و دارخورما و گيا و هێلكه‌ له‌كله‌ك... بتوانن بێ ته‌ده‌خولی عاميلی مرۆڤ ژيريێژيی ئه‌رستۆ و فه‌له‌كی به‌تلێمۆس و، شه‌ڕه‌كانی هانيپاڵ و دۆزينه‌وه‌ی (جذری تربيعی) له‌ بابلی چوار هه‌زار ساڵ پێش ئه‌مڕۆ و، خيلافی نێوان باوه‌ڕی غه‌زالی و ئيبن روشد و، به‌يه‌كه‌وه‌ هاتنی مولحيده‌كان و ئيمانداره‌كانی سه‌رده‌می عه‌باسی و، جودايی مه‌زهه‌بی حه‌نه‌فی و شافيعی له‌ ده‌ستنوێژشكان و ته‌ڵاقكه‌وتن و، په‌يدابوونی هه‌زار و يه‌ك زمان و ده‌ هه‌زار عاده‌ت و سه‌د هه‌زار عه‌شيره‌ت و مليۆنه‌ها شتی ديكه‌ی كۆمه‌ڵايه‌تی بده‌يته‌وه‌ به‌ گۆڕانی هۆی به‌رهه‌مهێنان"، جا ده‌پرسێ "ئايا گۆڕانی به‌ره‌و پێشی فيكری نووسه‌ر و هونه‌ركار و فه‌يله‌سوف به‌ستراوه‌ته‌وه‌ به‌ گۆڕانی قه‌ڵه‌می پێ نووسين و فرچه‌ و ره‌نگ و ته‌وش و به‌ردی هه‌يكه‌لتراشی و كاغه‌ز و مه‌ره‌كه‌به‌وه‌؟... به‌راست كام هۆی به‌رهه‌مهێنان له‌ حيجازی به‌ر له‌ هه‌زار و سێسه‌د ساڵ گۆڕا و قورئانی په‌يدا كرد و له‌ ماوه‌ی سێيه‌كی سه‌ده‌يه‌كدا تاج و ته‌ختی دوو ده‌وڵه‌تی هه‌ره‌ گه‌وره‌ی ئه‌و سه‌رده‌مه‌ی تێكدا و عه‌ره‌بی بێ ماڵ و حاڵ و بێ سه‌ودا و بێ ده‌وڵه‌ت و بێ ژياری كرده‌ فه‌رمانڕه‌وای به‌شێكی زۆری جيهانی پێشكه‌وتووی هه‌زار و سێسه‌د ساڵ پێش ئه‌مڕۆ؟ (تێنماگه‌م بۆچی) ئۆتۆمبێل په‌يدا بوو كه‌چی سۆفيه‌تی له‌ساڵانی (١٩٢٠-١٩٤٠) پتر په‌ره‌ی سه‌ند له‌و سه‌رده‌مه‌ی كه‌ سۆفی به‌پێيان يا به‌ سواری سه‌فه‌ری ده‌كرد؟"(٢٦).

هه‌ر له‌باره‌ی تێگه‌يشتنه‌ ماديیه‌كه‌ له‌ په‌يوه‌نديی نێوان ژێرخان و سه‌رخان ده‌پرسێ كه‌ بۆچی له‌ زۆر شوێنی دنيا هه‌مان باری ئابوری و گوزه‌ران و ده‌وروبه‌ر

(واتە هەمان ژێرخان، بەپێی دابەشکردنەکەی مارکسیزم)، چەندین سەرخانی جیاواز لە ئاین و رەوشت و دابونەریتیان لێ کەوتۆتەوە نەك هەمان سەرخان؟ "بۆچی دانیشتوانی یەك شار و یەك ئابوری و یەك رامیاری بەهۆی جوداوازیی زمانیانەوە یا دین و بیروباوەڕیانەوە دوو کەرت و سێ کەرت دەبن خۆ هەمووشیان هاوبەشی یەك زەرفی مادین"(٢٧) وەك نموونەیش لەسەر ئەوە دەڵێ "دەبینین موسڵمان و گاور و هیندۆس بۆ ماوەی هەزار ساڵ لە یەك دەروبەردا دەژین و نابنە یەك دین، تەنانەت ژنیش لە یەكدی ناهێنن، رەنگە دەسکوژی یەكدیش نەخۆن، جا ئەگەر مرۆڤ ئاوێنە بێ چۆن یەك دەوروبەر لە سێ ئاوێنەدا سێ شكڵی جودای دەبێ؟"(٢٨).

نووسەر پێی وایە ژێرخان مرۆڤە نەك ئابوری و هۆی بەرهەمهێنان و هەموو شتەکانیش لەوەوە سەرچاوە وەگرن و دروست دەبن "سەرخانەکان تەنها لە رەنگدانەوەی گاسن و گاز و تۆڕ و دەنکە گەنم و پێستە رێوی و سیستمی ئابورییەوە نین، گەر وا بوایە دەبوو لە هەموو وڵاتێ وەك یەك بویە... جیاوازیی سەرخانەکان لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکیتر بەڵگەیەکی بڕەرە لەسەر ئەوەی کە ژێرخانەکانیان جیاوازن. ژێرخان مرۆڤ و کۆمەڵگەی بەشەرییە، جا لەو روانگەیەوە کە مرۆڤ ئەزموون و تەسەور و پاشخانی رۆشنبیری و جۆری مامەڵەکردنی و میزاجی لە جێیەکەوە بۆ جێیەکیدی جیاوازە، شتێکی بەدیهییە کە بەپێی جیاوازیی وڵات و شار و گوند و گەڕەك سەرخانەکانیشیان جیاواز بن. (تەنانەت) غەریب نیە گرنکترین لایەنی سەرخان لای گەلێك هەمووی لە گەلێکی ترەوە وەرگیرابێ"، بۆ ئەوەش ئاماژە بە گۆڕانی سەرخانی کورد(ئاین و دابە نەریت و رەوشت) دەکات پاش هاتنی ئاینی ئیسلام بەشێوەیەك تەنانەت گۆڕانی سەرخانەکە بەپێچەوانەی هاوکێشە مارکسییەکە کە ژێرخانی بە بکەر(فاعل) و سەرخانی بە بەرکار(مفعول بە) دادەنا گۆڕانی سەرخانەکە بوو بە بکەر و ژێرخانەکەی گۆڕی و دەڵێ "کوردەکان لە ماوەیەکی پێوانەیی کورتدا چوونە ناو ئیسلام و جێی زەردەشتییان پێ گرتەوە لە زۆربەی سەرخانەکانیاندا و هەرچی ژێرخانێشکیشیان لەگەڵ بنەماکانی ئیسلامدا نەدەگونجان تەعدیلیان کردن و

وازیان له خانووی ئاگرەکانیان هێنا کە له تەنیشت ماڵەکانیانەوە بوون و روویان لە کەعبە و حەجەرولئەسوەد کرد" (٢٩).

نووسەر دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە تەفسیری مادی لە توانایدا نیە پێناسەیەکی دروستی مرۆڤ بکات کە بوونەوەرێکە جگە لە بەشە مادییەکەی خاوەن گیان و هۆش و ویست و شعوریشە، کە ئەمانە دیاردەی نامادیین. بوونەوەری زیندوو و هۆشیار و خاوەن ئیرادە مادەیەکی رەق و تەق و بێ ئیرادە نیە ئاراستەی رووداوەکانی دەوربەر بەرەو هەر لایەکی پاڵ پێوەبنێ بەو ئاراستەیە رێ بگرێتەبەر، بەڵکو توانای ئەوەی هەیە پێچەوانەی پێشبینیەکان و بارودۆخە مادییەکان بجوڵێتەوە و ئاراستەیەکی تر بۆ رەوت و ئاراستەی رووداوەکان و بزوتنەوەی مێژوو، جا بە رووە سەلبیەکەدا بێ یان بە رووە ئیجابیەکەدا، دیاری بکات.

بەپێی تیۆرەکەی مەسعود محەمەد وێنەی مرۆڤ وێنەیەکی داخراو و کۆتایی نیە کە بتوانرێ بە یاساکانی حەتمییەتی مادی بخوێنرێتەوە و لە روانگەیەوە پێشبینی ئایندەی بکرێ، بەڵکو ئەو خاوەن ماهییەت وێنیەکی کراوە و بزۆزە. ناتوانرێ تەنیا لە گۆشەنیگای مادیی رووتەوە خوێندنەوەیەکی دروست و مەنتیقی بۆ بوونەوەر و مێژوو و گۆڕانکارییەکانی بکرێ و هاوکێشە بۆ دیاریکردنی ئایندەی دابڕێژرێ، بەڵام بەناسینی مرۆڤ دەتوانرێ هەموو رووداوێکی مێژوویی شیتەڵ و تەفسیر بکرێ، چونکە مرۆڤ بابەتی مێژوو و هەروەها دروستکەریشیەتی، لەبەرئەوە هەوڵدان بۆ جێکردنەوەی مرۆڤ و ژیان و بونەوەر لە چوارچێوەی تەفسیری ماتریالیزمیدا شێواندنی رووی راستەقینەی بوون و ژیان و مرۆڤ و مێژووە، چونکە قاڵبی مادی سنووردار و پرسیارەکانی بوون بێسنوورن و بەگوتەی مەسعود محەمەد یش "پێوانی ئەو بێسنوورانە بە عەیارەی سنووردار گەپێکی سافیلکانەیە". لەم بارەیەوە دەڵێ "فەلسەفەی تەسك یا دەبێ لەئاست تەفسیری بوونەوەر هەڵبێت و کۆڵ بدات یا دەبێ جیهان تەسك بکاتەوە بۆ ناو قاڵبەکەی خۆی... دەبێ فیکری مادی خۆی لەبەریەك بکێشێتەوە بۆ ئەوەی بتوانێ تەفسیری دیاردەی نامادی وەکو سۆزی مریشك بۆ جوجەڵەکانی بکات"(٣٠) "فەلسەفەی تەسك و دنیای بەرین دوو

لایه‌نی یه‌کجار پێچه‌وانه‌ی موعاده‌له‌ی فیکرین... تۆ ده‌زانیت و منیش ده‌زانم موتڵەق و ئـــه‌زه‌ل و ئه‌بـــه‌د و نهێنییـــه‌کانی سروشـــت و مـــاده‌ی زینـــدوو و هۆشـــدار و دیارده‌یخواز(اراده) و خه‌سڵه‌ته‌کانی تری وه‌کو گیانله‌به‌ر و مرۆڤ و... پرسـیاره‌کانی نیسبی و فه‌له‌ك و ئه‌سڵی ماده و هه‌ستی شه‌شه‌م و حه‌وتـه‌م و سـه‌دان و هـه‌زاران هه‌زاری باسی ئه‌وتۆیی، خه‌یاڵی بێسنوور و وڕێنه‌ی به‌ربه‌ره‌ڵا و خه‌ونی ره‌ها تێیان بڕ ناکـات. جیهـان و پرسـیاره‌کان بێـسنوورن... نامه‌حـدوودن، دیاریـشه پێـوانی ئـه‌و نامه‌حدوودانه به عه‌یاره‌ی مه‌حدوود گه‌پێکی سافیلکانه‌یه"(٣١).

*** *** *** ***

راڤه یاخود ته‌فسیری به‌شه‌ریی بـۆ مێـژوو، کـه به‌رهـه‌می خوێندنه‌وه‌یـه‌کی ره‌خنـه‌یی نووسـه‌ره بـۆ یـه‌کێ لـه فه‌لـسه‌فه ماتریالیـسته‌کانی سـه‌ده‌ی بیـسته‌م و به‌شێوه‌یه‌ك له شێوه‌کان پێداگریی ده‌کات له‌سه‌ر بـوونی ره‌هه‌نـده رۆحییـه‌کان لـه بوون و ژیانی مرۆڤ و له هه‌ڵسوڕانی ره‌وتی مێژوودا له دوو رووه‌وه دۆستایه‌تیی له‌گه‌ڵ دیدگای ئاینیی دروست ده‌کات:

١- بـه حـوکمی ئـه‌وه‌ی فه‌لـسه‌فه‌ی مـادی له‌ســه‌ر بناغـه‌ی ره‌تکردنـه‌وه‌ی بنـه‌ما غه‌یبیه‌کانی ئاین و راستیی بانگه‌شه‌ی ئاسمانیبوونی په‌یامه ئاینیه‌کان دامـه‌زراوه و یه‌کێك له بوار و مه‌یدانه‌کانی کرد و کۆشـشی وه‌سـتانه بـه‌ڕووی ئـاین و هـه‌ژمون و هه‌سـت و عه‌قڵیـه‌تی ئـاینی لـه ژیانـدا، له‌به‌رئـه‌وه هـه‌ر دژه هـه‌وڵێکی فه‌لـسه‌فی به‌ئاراسـته‌ی ره‌خـه‌لێگرتن و گومـان دروســکردن له‌ســه‌ر بۆچـوون و لێکدانــه‌وه و تێگه‌یشتنه‌کانی ئـه‌و راڤـه ماتریالیزمییـه، خاوه‌نه‌که‌ی به‌هـه‌ر نیـه‌تێك و لـه هـه‌ر روانگه‌یه‌که‌وه کردبێتی، به‌سوود و قازانج بۆ ئاین ده‌گه‌ڕێته‌وه، ئه‌وه‌تا شوێنکه‌وتوانی ئاینه جیاوازییه‌کان به‌و هه‌موو جیاوازی و ناکۆکی و ته‌نانه‌ت شه‌ڕو شـۆڕانه‌یش کـه به‌درێژایی مێژوو و تا ئیسته‌ش له‌نێوانیاندایه ده‌بینی بۆ رووبه‌ڕووبوونه‌وه‌ی دوژمنێکی هاوبه‌شیان کـه ماتریالیزمـه سـوودیان لـه کـرد و کۆشـش و به‌رهه‌مـه‌کانی یـه‌کتر وه‌رگرتووه و گه‌ر به‌شێوه‌یه‌کی کاتیش بووبێ ناته‌بایی و کینه‌کانیان به‌رامبه‌ر یه‌کتر بێده‌نگ کردوه.

لێرەوە بەشێك لە کارەکانی نووسەر بەشێوەیەك لە شێوەکان چووەتە خانەی سوودی ئاینەوە با خۆیشی مەبەستی نەبووبێ. ئەم خاڵە تەنانەت لەلایەن چەپەکانی ئەو کاتەیشەوە هەستی پێکراوە و رەنگە هەر لەو روانگەیشەوە بووبێ کە -وەك خۆی باسی دەکات- بە "میتافیزیکییەت" و "رەجعییەت" تۆمەتباریان کردوە.

هەر بۆ نموونە نووسەر لە سەرەتاکانی بەرگی یەکەمی (مرۆڤ و دەروبەر)ەکەیدا کورتە وتووێژێکی خۆی لەگەڵ کۆمیۆنیستێك دەگێڕێتەوە سەبارەت بە پێشەکیەك کە نووسەر لەسەر شاعیرێکی لاهوتیی کورد نووسیویەتی و ئاماژەی بۆ کاریگەریی ئاین و رێزلێگیران و بەردەوامبوونی کردوە، کابرای کۆمیۆنیست پێی گوتوە "ئەوەی تۆ نووسیوتە لەبارەی تەئسیری دین و رێزلێگیرانیەوە رەنگە تەواو راست بێت، بەڵام چ فایدە کە پیاوە ئاینییە فێڵبازەکان ئەو تەرزە قسەیە بە زێڕ دەکڕن و لە هەواوە دەیقۆزنەوە".

٢- پێداگرتنی نووسەر لەسەر یەکەمایەتیی دەوری مرۆڤ و کۆمەڵ لە گۆڕانی مێژوو و ژیانی ئابوری و کۆمەڵایەتی و سیاسیدا، لە تەفسیری ئیسلامیی بۆ مێژوو نزیکە کە ئەمیش، لانی کەم بەلای ئەو بەشەی قوتابخانەی ئیسلامییەوە کە باوەڕی بە ئازادیی مرۆڤ هەیە و قوتابخانەی زاڵ و باوە لە فیکری ئیسلامیدا، مرۆڤی بە بوونەوەرێکی ئازاد و خاوەن ئیرادە زانیوە و بە بەرپرسیاری داناوە لەبەردەم کردار و رەفتار و دارِشتنی بناغەی ژیانێکی ئاسوودە و پێشکەوتوو، چاکبوون یان خراپبوونی ژیانی هەر تاك و کۆمەڵگەیەکی بە هەڵوێست و هەڵبژاردنی مرۆڤەکانەوە بەستۆتەوە. خۆ ئەگەر وا نەبێ و مرۆڤ داشی دامە و دەوروبەر و بارودۆخی مادی و ئابوری دامەچی بن ئیدی مرۆڤ هیچ بەرپرسیاریەتییەکی لەبەرامبەر کردار و گوفتاریدا ناکەوێتەسەر و بەوەش باوەڕ بە رۆژی دوایی کە یەکێ لە کۆڵەکە سەرەکییەکانی ئیمانە لە ئیسلامدا بایەخی نامێنێ، چونکە حیکمەت لە بوونی ئەو رۆژە وەرگرتنەوەی پاداشت و سزایە لەسەر کار و کردەوەکانی دنیا، چاکە بە چاکە و خراپە بە خراپە. چەندین دەق لە قورئان و فەرمودە هەن راشکاوانە باس لە ئازادیی ئیرادە و هەڵبژاردن و

بەرپرسیارێتیی مرۆڤ و کۆمەڵگە دەکەن "ان الله لایغیر ما بقوم حتی یغیروا ما بانفسهم"الرعد–١١/ "ذلك بان الله لم یك مغیرا نعمة أنعمها علی قوم حتي یغیروا ما بأنفسهم"الانفال–٥٣/ "وما اصابك من سیئة فمن نفسك" النساء–٧٩.

بەپێی دەقە دامەزرێنەرەکانی ئانی ئیسلام (قورئان و فەمووده) سەرچاوەی گۆڕانکاریی سەلبی و ئیجابی پەیوەستە بە ناخی مرۆڤەوە، بڕیارەکان لەوێوە دەردەچن وئەندامەکان جێبەجێیان دەکەن، واتە هۆکاری خێر یان شەڕ، پێشکەوتن یان پاشکەوتن بەپلەی یەم مرۆڤ خۆیەتی نەك دەوروبەر (ظهر الفساد في البر و البحر بما کسبت ایدي الناس)الروم–٤١/ (وما ظلمناهم ولکن ظلموا انفسهم) هود–١٠٢/ (وما اصابك من مصیبة فبما کسبت ایدیکم) الشوری–٣٠/ (وان لیس للانسان الا ماسعی، وان سعیه سوف یری) البقرة.

بنەمای بەرپرسیارێتیی مرۆڤ لەبەردەم خودا و یاسادا رەهنە بە ئازادیی ئیرادە و جموجوڵی مرۆڤەوە و ئەسڵی ناردنی پەیامبەرانی خوا لە درێژایی مێژوودا و بانگەوازکردنی نەتەوەکانیان بۆ شوێنکەوتنی پەیامەکانیان باوەڕی تەواو بە ئازادیی مرۆڤ و دەوری لە دیاریکردنی چارەنووسی خۆی و نەتەوەکەیدا دەردەخات. هەروەها کۆڵنەدانی پێغەمبەران لەبەرامبەر فشار و هەڕەشەکاندا و هاندانی شوێنکەوتوانیان بۆ دان بەخۆداگرتن و هەوڵ و کۆششی بەردەوام بەئومێدی سەرکەوتن و بەرگەگرتنی جۆرەها ئازار و ئەشکەنجە لەپێناو پەیامەکانیاندا، بەروونی ئەوەی لێ دەخوێنرێتەوە کە مرۆڤ بوونەوەرێکی خاوەن بڕیارە لە ژیاندان نەك پەڕە مریشکێك بەدەم رەشەبی رۆژگار و یاسا حەتمییەکانی بوونەوە.

## دووەم: ریشەداریی ئاین و هەستی ئاینی:

یەکێ لەو نموونە و بەڵگانەی مەسعود محەمەد لە بەرامبەر بۆچوونەکانی ماتریالیزمی مێژوویی ئاماژەیان پێ دەکات و دەیکاتە نیشانەی پرسیار لەسەر ئەو فەلسەفەیە، مەسەلەی ئاینەکان و هەستی خواپەرستی و کاریگەریی و ریشەداریی

ئاینە لە دارشتنی عەقڵیەتی مرۆڤ و جموجوڵی رۆژانەیدا، ئەمە لەکاتێکدا بیریارانی سەر بەو قوتابخانەیە ئاینیان بە "تلیاکی گەلان" و شتێکی بێبناغە و بێ کاریگەریی راستەقینە لە سەر گۆڕانی کۆمەڵایەتی و مێژوو دادەنا، کە لەگەڵ پێشکەوتنی هۆیەکانی بەرهەمهێناندا خۆ بەخۆ و بەپێی یاساکانی حەتمییەتی مێژوویی دەپوکێنەوە و لەنێو دەچن.

نووسەر لە چەندین تەوەرەدا بەبەڵگەی زیندوو لە ژیان ریشەداریی و کاریگەریی هەستی ئاینیی و مەعقولییەتی راڤەی ئاینی بۆ بوون بەبەراورد لەگەڵ راڤە مادییە یەك رەهەندەکەدا و، دەوری ئەم وێنە زیندووەی ئاین لە هەست و ناخ وژیانی مرۆڤ و کۆمەڵگەکاندا لە پووچاندنەوەی تەرحەکانی ماتریالیزمی مێژووییدا دەخاتە روو.

لەو تەوەرانە:

١ – وێنای ئاینی بۆ تەفسیری بوونەوەر فراوانترە:

مەسعود محەمەد لەمیانی موناقەشەکردنی دیدی ماتریالیزم سەبارەت بە خوێندنەوەی باری کۆمەڵایەتی و بزووتنەوەی مێژوودا لە چەند جێیەکدا ناراستەوخۆ ئاماژە بەوە دەکات کە دیدی ئاین، کە باوەڕی بە هەردوو لایەنە مادی و غەیبیەکەی ژیان و بوون هەیە، فراوانتر وگشتگیرترە و زیاتر بوار بە خوێندنەوەی یاساکانی بوونەوەر و ژیان و مرۆڤ (بەگشت رەهەندەکانیانەوە) دەدات تا مادییەت، ئەویش لەو رووەوە ئاین لەگەڵ جەختکردنی لەسەر کاریگەریی غەیب و جیهانی رۆح لە هەڵسوڕاندنی شتەکان و دارشتنی یاساکانی جووڵەی مێژوو و گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا، باوەڕیشی بەوە هەیە کە یاسا مادییەکان و جیهانی مادەش حەقیقەت و گرنگی و رۆڵی حاشاهەڵنەگری خۆیان هەیە لە دروستکردنی هاوکێشە ژیانییەکاندا و هەردوو رەهەندەکە پێکەوە رووداو و دیاردەکان دروست دەکەن و بەڕێوەدەبەن، بەپێچەوانەی تەفسیری مادی کە نووسەر بە "تەسکبین" وەسفی دەکات و تەنیا

جیهانی مادی و دەستوراتی مادی لەبەرچاو دەگریّ و لـە هـەولّی ئەوەدایـە گشت حالّەت و دیارە و رووداوەکانی مرۆڤ و میّژووی پیّ راڤە بکات و لیّك بداتەوە.

لەم بارەیوە دەلّیّ "بەنموونە دەلّیّم سۆزی دایك بـۆ بیّچووەکەی درەنگـتر خۆی بەدەست تەفسیری مادیی تەسکبینەوە دەدات لەو تەفاعولـە کیمیاییـەی کـە بەپیّی دەستوری رەق و زەق پیّك دیّت، کەچی کابرایـەکی میـسالی غەیبپەرسـت زۆر بەئاسـانی دەتـوانیّ بلّـیّ ئـەو سـۆزە مەعنەوییـە لـەم مریشکە نەزانـەوە بـۆ ئـەو جوجەلّانەی ... بەهرەیەکی خوداییە، بیّ ئەوەی تەناقوز لە باوەڕەکەی خۆیدا بکات. لیّرەدا هەرگیز مەبەستم ئەوە نییە بلّیّم بیرکەرەوەی مادی واز لە باوەڕەکەی خـۆی بهینیّـت و ببیّتـە خوداپەرسـت، خـۆ ئەگـەر ئەمـەش بکـات پـەکی لایـەنی مـادیی بیروڕایەکەی ناکەویّت، چونکە خوداپەرستەکانیش باوەڕیان بە دەستوورەکانی مادی هەیە"(٣٢).

هەروەها ئاماژە بەوە دەکات کە تەنانەت خودی مادییەکانیش هەست بەوە دەکەن ئەو قالّبە مادییەیان هیّز و پیّـزی ئـەوەی نییـە تەفـسیری هـەموو دیـاردە و رواڵەتەکانی ژیانی پیّ بکریّ، بەلّام هەندیّ پـالّنەری تری دەرەوەی لایەنە زانستی و فەلسەفییەکە ناچاری پیّداگرتن لەسەر بەراسـت زانینـی ئـەو تەفـسیرەی کـردووەن، مەسعود محەمەد لەم میانەیەدا ئەم بەسەرهاتە دەگیّڕیّتەوە:

"جاریّکیان لەگەلّ ئاشنایەکی کۆمیۆنیستدا لە هەندیّ باری تیّـك هەلّقـژانی فیکری و مـادی و نامادییـەوە وتویّـژم دەکـرد، لـەنیّوان قـساندا گـوتم بیرکـەرەوەی ماتریالیست چ مانعیّکی لەوەدا نییە ئەو حیکایەتە بسەلمینیّ کە دەلّیّ: دەمەوعەسر پشیلەیەك بیّچوەکانی خۆی لە دێیەکی بناری شاخیّکەوە راگویّست بۆ ئەوبەری دۆلّی دامەن دێیەکە و بەشەو هەرەسی بەفر دێیەکەی ویّران کرد و خەلّکەکەی کوشت، یا سەگیّك لەپڕ کزی و عاجزی دایگرت و دوای چەند رۆژێك خاوەنـە خۆشەویستەکەی مـرد، بـەلّام هـەمان ماتریالیـست ناسـەلمیّنیّ پیـاویّکی وەك حـەلاج بـایی پـشیلەکە کەرامەتی هەبوبیّت. لە وەلّامـدا گـوتی: پیـاوە ئاینییـەکان هیّنـدەیان فیّـلّ لـە لـە ئادەمیزاد کردوە و سەریان لیّ شیّواندوە و بۆ تـەماعی خۆیانیان چەوساندۆتەوە بۆیە

ئینکاری کەرامەتیان دەکەین، پێم گوت: من ئەم وەڵامەت لێ قبوڵ دەکەم بە مەرجێك داوای عیلمانیەت و گیانی زانستپەرەوەری و ئینساف و...هتد واز لێ بهێنیت و دان بەوەدا بێنیت کە مرۆڤێکی ئینفیعالیت"(٣٣).

لەباەری داننانی ئاینیش بە یاسا مادیەکاندا و دەوریان لە کارلێکی سروشتی و کۆمەڵایەتیدا مەسعود محەمەد دەڵێ "مەلاکانی ئیسلام بەر لە هەزار ساڵ گوتویانە "حقائق الاشیاء ثابتة و العلم بها متحقق"، تەنها جوداوازییەك هەبێ لەنێوان ئاینپەرست و مرۆڤی مولحید لەو مەیدانەدا ئەوەیە کە پیاوە ئاینییەکان باوەڕیان بەوە هەیە کە ئەگەر خودا بیەوێ دەتوانێ هەرچی زانستی جیهانی هەیە، هی لێرە بە پێشەوە و هی لێرە بەدواوە کەوا جارێ پەیداش نەبووە بخاتە مێشکی نەخوێندەوارێکەوە"(٣٤).

دواتر جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە فیکری دوانەتی (الثنائیة) لە تەفسیرکردنی شتەکاندا، واتە لەبەچاوگرتنی هەردوو رەهەندی مادی و مەعنەوی، هیچ لە نرخ و کاریگەریی یاسا مادییەکان کەم ناکاتەوە چونکە یاسا مادییەکان لە فیکرەی دوانەتیدا حسابیان بۆ کراوە و پێویست ناکات ماتریالیستەکان لەو رووەوە مەترسییان هەبێ "بیرکەرەوەی مادی هیچ هەقێکی بەدەستەوە نییە لەوەدا کە بترسێ دوانەتی پایەی مرۆڤی پێ دالەنگێنێت بۆ ژێر پایەی مادەی مردوو، وە یا ئینکاری دەوری هەرە گرنگ و سەربەخۆی هێزی زیندوەتی و ئیرادە و هۆش لە رووداوی بایۆلۆجی و کۆمەڵایەتی و مێژوودا بکات، چونکە کە ئەو لە سەرەتای هەڵنانی فەلسەفەکەیەوە هەموو هێزی فیزیکی و غەیری فیزیکی لەگەڵ هەموو رووبان و گۆڕان و بوون و بەسەرچوون بداتەوە بە تاکە ماك و سەرچاوەی مادە بێ ئەوەی دان بە هیچ سەرچاوەیەکیدیکەدا بهێنیت و کەلێن بۆ بوونی خوا و هێزی غەیبی میتافیزیکی لە فەلسەفەکەیدا بهێڵێتەوە، یەك زەرە زیان لە لە وەحدانیەتی مادە ناکەوێت نەزەریەکەشی کونی تێ نابێ ئەگەر سەرلەبەری گۆڕانی کۆمەڵایەتی بە تاکە کاریگەری هۆش ببەخشێت و بایی فلسێك بایەخ بە نەوت و پێستە رێوی و ئاسن و بنێشت نەدات"(٣٥).

ههروهها زیاد لهوه راشکاوانهتر دهڵێ "دین بهر لهوهی بیری مادی سهر به سیاسهتیش پهیدا ببێ و بهر له ههزاران ساڵ، بۆ حسابی خۆی نهك بۆ حسابی دنیا، گوتووهتی ماده پشتگوێ ناخرێ، خۆ ئیسلامهتی لهلای خۆیهوه ههموو سهرویهرێکی دنیای لهبهر رۆشنایی دین رێك خستووه و گهلێك گۆشهی گرنگی گوزهرانیشی به یاسا و دهستوورهکانی خۆی تهنیوهتهوه، ئینجا شهرمیشی نهکردوه بلێ دنیاکه پرده بۆ قیامهت... لهوهوه دهزانیت بابهخدانی دین به دنیا نه بهرگی درۆزنه له خۆی ئاڵاندوه و نه فیکرهکهشی له فهلسهفهی مادی وهرگرتوه"(٣٦).

*** ***

٢ – بهردهوامی و کاریگهریی ئاین لهسهر مرۆڤ:

یهکێك لهو بابهتانهی مهسعود محهمهد زۆر جاران به رووی بیریارانی ماديدا دهدات و دهیکاته نیشانهی پرسیار لهسهر فهلسهفهکهیان بۆ خوێندنهوهی مێژوو مهسهلهی بهردهوامبوونی ئاینهکانه به درێژایی سهدان و ههزاران ساڵ لهنێو کۆمهڵگه جۆراوجۆرهکانی دنیادا تا دهگاته رۆژی ئهمڕۆ، ههروهها ریشهداریی ئهو ههسته ئاینییه له کۆناخی مرۆڤهکاندا بهرادهیهك تهنانهت مهسهله ئابوورییهکانیشی داوهته دوای خۆی، ئهمه لهبارێکدا بهلای قوتابخانه ماتریالیستیهکانهوه ئاین و ههستی ئاینی هیچ نین جگه له کهلهپووری نهزانانهی سهردهمه دێرینهکان و ئامرازێکی دهستی بۆرژوا و دهوڵهمهند و دهسهڵاتدار و پیاوانی ئاینی بۆ فریودانی خهڵکه رهشۆکیهکه و توانانی مانهوه و خۆراگرییان نییه له سهردهمی پێشکهوتن و سهرکهوتنه زانستی و رۆشنبیرییهکانی مرۆڤایهتیی هاوچهرخدا.

بهلای نووسهرهوه تهنانهت ئهوهش که ئاین ههندێ جار لهلایهن پیاوانی ئاینی یان دهسهڵاتهوه بۆ فریودانی خهڵك و بهدهستهێنانی دهسکهوت و بهرژوهندیی تایبهت و شهخسی بهکاردههێنرێ، ئهگهرچی زۆر جاران لهسهر ئاین و کهلتورهکهی حسێب دهکرێ، بهڵام له راستیدا دهشبێته بهڵگه لهسهر ریشهداریی ئهو ههسته لای مرۆڤهکان، ئهویش لهو رووهوه که خهڵك زیاتر باوهڕ به کهسێك دهکهن که مۆرکێکی ئاینی بهخۆی بدات، واته متمانهیان به ئاین ههیه، ئهویش لهبهر پیرۆزیی ئاینهکهیه له

دڵیاندا، ئەگینا بۆچی ئەو بەرژەوەندپەرستانە ناچن لەژێر ناوێکیتری نائاینیدا بەو ساختەکارییە هەڵسن و خەڵکیش باوەڕیان پێ بکات؟!

هەروەها باس لەوە دەکات کە خۆشەویستیی ئاین زۆر جاران لای ئاینپەروەران پێش کاریگەریی ئابوری و بەرژەوەندیی مادی دەکەوێ و ڕێ دەکەوێ بەرژەوەندییە مادیەکان دەکرێنە قوربانیی ئاینداری. لەبارەی ئەو بۆچوونەیش کە پێی وایە ئاین و خوداپەرستیەکان هیچ ڕۆڵێکیان لە گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا نییە و ئەمەش دەکەنە بەڵگەی بێبناغەیی ئاین، ئاماژە بەوە دەکات کە ئەگەر دین هێندە بێبایەخ و بێسوود بوایە چۆن لایەنی مادیەتیی ژیانی کۆمەڵایەتی ڕێی دەدا دینێکی وا بارتەقای مادییەت بێ و لەو زیاتریش ڕەگ دابکوتێ و تەنانەت مادەیش بخاتە خزمەتی بەرژەوەندیی خۆی؟!

مەسعود محەمەد دەڵێ "چەند سەیرە ملیۆنەها خەلق لەخۆوە بەئەرك و مەسرەفی خۆیان خەریکی بەردەوامکردنی باوەڕێکم بن کە بەلای بیرکردنەوەی مادیی عیلمانیەوە فڕی بەسەر ڕاستی و مادە و سوودی خەلقەوە نیە، کەچی فەلسەفە مادییەکە کە خۆی داناوە بە ئاڵای سوود و خێر و خۆشی گەلن ئەگەر پۆلیس و عەسکەر نەیپارێزن لەوانەیە بەزوویی لەبیران بچێتەوە" بۆیە دەڵێ "دیارە ئاین ئەو بێ بنج و بناوانە نیە لە دڵ و دەروونی خەڵقدا کە موعادەلە سەراوییەکانی فەلسەفەی مادیی سەر بە کۆمەڵایەتی بۆی هەڵدەنێن. ئەگەر ئاین ئەو کەم بایەخ و بێ بنجەیە لە دڵاندا... بۆچی مرۆڤی عادەتی بە دوو فێڵی شێخی نیوە خوێندوو واز لە ماڵەکەی خۆی دێنێت بۆ خاتری ئەو باوەڕە کەم بایەخ و بێ بنجە؟ بۆچی شێخەکە ناتوانێ بەغەیری ئەو شتە (کەمبایەخ و بێ بنجە) داوای ماڵی دنیا و بگرە گیانیش لەوخەڵقە بکات؟ بۆچی فەیلەسوفە مادییەکە کە خۆی بە هەموو بیروباوەڕە ڕۆشن و مرۆڤدۆستەکانی خۆیەوە ناتوانێ دەیێکی فێڵبازە درۆزنەکە خەڵك بەداوی خۆیدا ڕاکێشێت ئەگەر پۆلیس و عەسکەر خەڵقی بۆ نەتۆقێنن؟ بۆ دەبێ مەرقەدی کابرایێکی مردووی هەزار ساڵە لە دوورایی هەزاران کیلۆمەترەوە مرۆڤی بێ پارەی بێ دەسەلاتی لاتی ڕووت و قوت بۆ خۆی ڕاکێشێت و بەدەوری پەڕۆ پاڵەکەی خۆیدا

خولی پێ بدات و هەزاران فرمێسکی لەچاوان هەڵوەرێنێ، هیچ حکومەت و دەسەڵاتی دنیایی و چاوسوورکردنەوەش لەو کارەدا دەستی نەبوبێت؟" جا دەپرسێ "چۆن دەشێ وەها بەئاسانی ئەم هێزە زلەی ئاین بە دوو موعادەلەی قوت و قرتاو بپوچێنێتەوە کە لە واقیعهدا نەك ناپوچێتەوە، بەڵکو پتریش تاو دەگرێ"(٣٧).

دواتر رەخنە لە وتارێکی نووسەری چەپی میسریی فوئاد زەکەریا دەگرێ کە، وەك باسی دەکات، رۆژی ١٩٧٦/٨/٢ لە ژمارە ٢٥١٢ی گۆڤاى (روز اليوسف)دا بڵاو کراوەتەوە و تێیدا ناوبراو بەپێی بەرژەوەندییەك کە خۆی بۆ بەرەی مارکسیستی رەچاو کردوە، بەتایبەتی لەناو موسڵماناندا، پاساوی بۆ فیکرەی (ئیلحاد) لە مارکسیزمدا هێناوەتەوە و ویستویەتی ئەوە بسەلمێنێ کە مارکس لەوەی ئاینی بە تلیاکی گەلان وەسف کردوە مەبەستی هەموو ئاینەکان نەبووە، بەڵکو هەڵوێستەکەی پەیوەست بووە بە چەرخ و فەرهەنگ و ئاینێکی تایبەتەوە و بەوتەی زەکەریا ئەگەر مارکس ئاگای لە ئەزموونی ئیسلام بوایە لە وڵاتانی جیهانی سێدا کە چۆن داینەمۆی بزوتنەوە شۆڕشگێڕی و ئازادیخوازەکان بووە "رێی تێدەچوو بە بڕیارەکانیدا بچوایەتەوە بەشێوەیەك حسابی بۆ ئەو رۆڵە شۆڕشگێڕییە بکردایە کە ئاین لە هەندێ لەو کۆمەڵگایانەدا دیوێتی".

مەسعود محەمەد ئەم قسەیەکی فواد زەکەریا بە یەکێك لە نیشانەکانی پاشەکشەی مارکسیەکان لەبەردەم هەڵکشانی هەستی ئاینی، بەپێچەوانەی پێشبینییەکانی فەلسەفەکە، دەبینێ، ئەگینا ناکرێ کەسێکی وەك مارکس ئەوەندە بێئاگا بووبێ لە مێژووی ئاینێکی بەرفراوانی وەك ئیسلام، کەچی ئەو بڕیارە بەسەر هەموو ئاینەکاندا بگشتێنێ.

مەسعود محەمەد دەڵێ "قەناعەتم هەیە مارکس بێئاگا نەبوو لە ئیسلامەتی بە کۆن و نوێیەوە... ئیتر نە مارکس و نە من و تۆش ئەوە ناسەلمێنین کە ئیسلامەتی هەر لەو کاتەوە کە ئیستیعمار بەرەنگاری عالەمی سێیەم بووە بۆتە ئازادیخواز، خۆ ئەوەی راستی بێ لە هەموو مێژووی نوێی ئیسلامەتیدا پیاوی وەك عەلی کوڕی ئەبوتالیب و عومەری کوڕی عەبدولعەزیز مرۆڤدۆست و دژەستەم و دیموکرات و

دادپەروەر نە پەیدا بووە و نە ڕێی پەیدا بوونیشی هەبووە...مارکس ئەو ڕاستییە رووتەی دەزانی، لەوەش بەولاوە لەلایەن بەگژداچوونەوەی داگیرکەرەوە تۆ بڵێی باس و خواسێکی شەڕی خاچپەرستەکان و سەلاحەدینی ئەیوبی نەبیستبێ؟".

ئەنجا باس لەوە دەکات کە ڕەنگە مارکس پێشبینی ئەوەی نەکردبێ ڕۆژێك لە ڕۆژان شوینکەوتوەکانی بۆ پاساودانی شکستەکانیان پەنا بۆ بەنەزان دانانی ئەو ببەن تا هیچ نەبێ پاساو بە شوێنەکەوتەیی خۆیان بۆ ئەو فەلسەفەیە بتاشن"وا دەزانم مارکس خەیاڵی بۆ ئەوە نەچووە کەوا ڕۆژێك دێت دۆستەکانی هەر ئەوەندەیان پێ دەکرێ بۆ لەسەرکردنەوەی کە بڵێن ئەی مەردم لە مارکس مەگرن وەها بێباکانە لە ئاین دواوە، چونکە کابرایەکی کەم زان بوو، ئاگاداری مێژووی کۆن و نوێ نەبوو. هەر هێندەی لەبارەی ئاینەوە دەزانی کە بە چاو دەیدیت"، بەم پێیەش بێت "دەبێت سیفەتی عیلمانیەت لە فەلسەفەکەی مارکسیەت داڕنین و پێی بڵێین ئەمە گڕوگاڵی بابایەکی ڕق هەڵساوی کەم زانە"(٣٨).

دواتر لەبارەی دیاردەی فریودانی خەڵك بەنێوی ئاینەوە لەلایەن پیاوانی ئاینی یان غەیری ئەوانەوە باس لەوە دەکات کە تەنانەت ئەو کردارانەیش لە دەرەنجامدا ریشەداریی هەستی ئاینیی مرۆڤ دەسەلمێنن و دەپرسێ "بۆچی پیاوێکی عادەتیی لاهور، کابول دڵیان نایەت بایی دوو دینار لەپێناو بەرژەوەندیی گشتی ماندوو بن کەچی بە کوێرەوەری چەند سەد دینارێك پەیدا دەکەن و دەچن بۆ حەج؟ ...(مادییەکان) دەڵێن کابرای حەجکردوو دوای گەڕانەوەی بەهۆی کەشیدەی سەریەوە باشتر دەتوانێ لە مامڵەتدا فیڵ لە خەڵك بکات... ئەم خەیاڵە نەك هەر بەتاڵە، بەرەواژیشە... چونکە ئەگەر بشسەلمێنین هەموو جاران حاجی بەنیازی فیڵ لە خەڵق کردن دەچێتە حەج، کە ئەمە پێوەندیی بەڕاستیەوە نییە، بەوەدا هەر هەڵوەستی مام حاجیمان ڕون کردەوە، ئەو خەڵقەی کە بە کەشیدەکەی هەڵدەخەڵەتێن، بۆ کام تەماعی مادی لە حاجی دەسەلمێنن فێڵیان لێ بکات؟ بەراستی حورمەتی حەجەکە بەلای خەڵقەوە لەوەدا پتر دەردەکەوێ کە حاجی بۆ دەستبڕین حەج بکەن چونکە هەڵبەت ئەو نیازەی دەست بڕین، کە هەبێ، دەنگ و

باسێکی ده‌گاته‌وه لای خه‌ڵق، ئیتر که له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا گوێ نه‌ده‌نه فێڵبازییه‌که‌ی و هه‌ر مامڵه‌تی له‌گه‌ڵدا بکه‌ن، دیاره حورمه‌تی که‌عبه گه‌لێك له‌وه پتره که من وتۆ به خه‌یاڵماندا دێت.. حورمه‌ته‌که‌ش هی غه‌یبه نه‌ك هی دنیا، ده‌نا ده‌بوو فێڵبازێکی کورد بچێ سه‌ردانی قه‌ندیل و ده‌شتی دزه‌ییان بکات، که ئه‌ویان هاوینه‌هه‌وارێکی به‌هه‌شت ئاسایه، ئه‌میشیان ئه‌نباری گه‌نمه زێڕینه‌ی وڵاتی کوردانه، ئیتر بگه‌ڕێته‌وه بۆ دێیه‌که و شاره‌که‌ی خۆی و به خه‌ڵق بڵێ: ئاوه‌رن ده‌ستم ماچ بکه‌ن و لێم گه‌ڕێن قۆڵتان بیرم چونکه حه‌جی وڵاته پیرۆزه‌که‌تانم کردووه ! ! فروفێڵی حه‌جکردووان پتر ئیسپاتی به‌رزیی پله‌ی حه‌ج له دڵاندا ده‌کات نه‌ك به پێچه‌وانه‌وه... بیستوومه له وتووێژدا گوتراوه له ساڵی گرانیدا قورئانیان به‌نان ده‌دا، به‌مه‌ش وا راده‌نوانرا که حورمه‌تی نان له قورئان پتر بێت، به‌ڵام مه‌سه‌له‌ی فرۆشتنی قورئان بۆ په‌یداکردنی نان له‌ساڵی گرانیدا نرخه مه‌عنه‌وییه یه‌کجار زله‌که‌ی قورئان نیشان ده‌دات، چونکه له‌و ته‌رزه قات وقڕییه‌دا هه‌ر زێڕ و ملك و شتی ئه‌وتۆیی نانی پێ ده‌هات، ئه‌گه‌ر ئه‌ولادت فرۆشتبا که‌س نانێکی پێ نه‌ده‌دا، که‌واته ئه‌گه‌ر راست بێ قورئان نانی هێناوه دیاره گه‌لێك به‌ولای زێڕ و ملك و نانه‌وه به‌حورمه‌ت بووه لای ئه‌و که‌سه‌ی کڕیویه‌تی، چونکه قورئان نه ده‌خورێ نه له‌به‌رده‌کرێ و نه ده‌زێ و نه فلسێکت ده‌خاته گیرفانه‌وه و نه هیچ جۆره سوودێکی مادی لێ په‌یدا ده‌بێ"(٣٩). "فکری مادی ئه‌گه‌ر راستیان له‌بیری خۆی نه‌باته‌وه ناچاره ده‌بێ بیسه‌لمێنێ ئه‌و دینه‌ی که به‌لای مادیه‌ته‌وه ته‌مومژی نه‌زانیی مرۆڤ و ساوایی گڕوگاڵی کۆمه‌ڵایه‌تییه پتر چه‌نگاڵی له ماده و مه‌عنای مرۆڤ گیر کردوه له هه‌موو ئه‌و یاسا و ده‌ستوورانه‌ی که به‌لای مادیه‌ته‌وه کاکڵ و ناوه‌رۆك و چه‌رخ و مه‌نگه‌نه‌ی بوون و به‌ره‌وپێش چوون وکامه‌رانییه"(٤٠).

نووسه‌ر ئه‌و بۆچوونه‌ی مادییه‌کان ره‌ت ده‌کاته‌وه که پێیان وایه په‌رستشه‌کان هیچ ده‌ورێکی جه‌وهه‌ریی له گۆڕانی کۆمه‌ڵایه‌تی و بزووتنه‌وه‌ی مێژوودا نییه، ره‌خنه‌که‌ی له‌و رووه‌وه‌یه که له لایه‌ك ئه‌گه‌ر ئه‌و قسه‌یه راستیش بێ دیسان وابه‌سته‌بوونی سه‌رسه‌ختانه‌ی مرۆڤی باوه‌ڕدار به په‌رستشه ئاینییه‌کانه‌وه نیشانه‌یه‌کی پرسیاری گه‌وره له‌سه‌ر ته‌فسیره مادییه‌که دروست ده‌کات، له‌لایه‌کی

تریشەوە ناکرێ شتێکی هێندە بێ بنج و بناوان و بێ رەگ و ریشە لە ناخ و سروشتی مرۆڤدا بەو شێوەیە شان بەشانی مێژوو لەگەڵ مرۆڤدا بەردەوام بێ و مرۆڤ خۆویستانە بەدوای بکەوێت و رێورەسم و داخوازیەکانی جێبەجێ بکات، لەم بارەیەوە نووسەر دەڵێ "بێ تەئسیربوونی نوێژ و رۆژوو و حەج و تەقوای عادەتی لە گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا نابێتە دڵدەرەوەی بابای ماتریالیست لە پێکگرتنی نرخی دین و دنیا لە نەزەر کۆمەڵانی مرۆڤ کە بەدرێژایی ئەزەل دینداریی عادەتییان کردوە، چونکە هەرچەندە ئەو دینداریییە عادەتییە گۆڕانیشی پەیدا نەکردبێ، دیسان بەلای کەمەوە لە دوو نوختەی زۆر گرنگەوە بۆچوونەکانی مادی پاشگەز دەکاتەوە:

نوختەی یەکەم ئەوەیە کە دەبوو لایەنی مادییەتی ژیان و کۆمەڵایەتی لە بنەڕەتدا رێ نەدا بە پەرەسەندنی دین و زوو بە زوو لە بن قورسایی و رۆشنایی راستییە مادییەکان دین خەفە بێت، چۆن دەشێ لەبەر رۆشنایی فیکری مادیدا بسەلمێنین کە دینی وەها بێ بنج و بێ بایەخ و زەرەربەخش (لە نەزەر مادییەتدا) بتوانێ بارتەقای مادییەت و پتریش لەو بەردەوام و بەرقەرار و رەگ داکوتاو بێ؟

نوختەی دووەم ئەوەیە کەوا دین بەولای بەردەوامییەوە دێت و سواری بەرژەوەندیی مادی دەبێت و لە خۆی خەرج دەکات. حاجی لوقمەی زاری خۆی و منداڵەکانی دەگێڕێتەوە و دەیکاتە بیتاقەی سەفەری سەر چاك و پیران... کوێخا گاڕەشەکەی بەدیاری بۆ خزمەت شێخ دەبات... تەڵاق خواردوو وەك دەروێشی گەڕیدە گونداوگوند لە مەلای دوازدە عیلم دەگەڕێ... ساڵانە دوو ملیۆن بەرخ و شەك لە کژی حەجدا بەدەوری کەعبەوە سەردەبڕێت و گۆشتەکەی خەسار دەبێت"(٤١).

دوای ئەوە دیسان جەخت دەکاتەوە لەوەی "فێڵکردن و تەڵەکەبازی هەرگیز نابێتە بەڵگەی بێبایەخیی ئەو کارەی فێڵی پێوە دەکرێ، لە هەموو ئەو بارانەشدا کە بەرگی ساختە لەبەر نیازی نهێنی دەکرێ، حورمەت و بایەخی بەرگەکە بەئیسپات دەگات"(٤٢).

نووسەر هەر لە تەوەرەی باسکردن لە کاریگەریی ئاین لەسەر مرۆڤ وقووڵیی هەستی ئاینیی لە ناخی مرۆڤی ئاسایدا لە لاپەڕە ١٥٤ تا ١٦٢ی بەرگی دووەمی (مرۆڤ

و دەوروبەر)دا ئەو بۆچوونە رەت دەكاتەوە كە پاڵنەرەكانی جەنگی خاچپەرستەكان بە هۆكاری مادی و دەسكەوتی مادی لێك دەداتەوە و، لە دوو نوختەی سەرەكییەوە رۆڵی ئاین لە بزواندنی مەسیحیەكان بۆ ئەو جەنگە دەخاتە روو و پاڵنەرە دنیاویستیەكان دەخاتە پەراوێزەوە، ئەوانیش بریتین لەوەی:

١- شەڕەكە "لە بنەڕەت و رواڵەتیشدا شەڕێكی ئاینی بوو هەرچەند لەوەشدا وشكەباوەڕی سەرلێشێواو هاندەر بووبێ... بێگومان هەرای هێندە گەورە و بەردەوام بەبەریەوە هەیە چەندێ بلێی لە سوودپەرست و تەماعكار و جەردە و زۆردار و نیازمەند و فێڵبازان بخاتە جموجوڵ" جا ئەگەر ژمارەیەك توجار و تەماعكاریش لەو نیوەندەدا سوودمەند بن و ئەم ئامانجە پاڵنەری جوڵەیان بووبێ، خۆ "زۆربەی ئەو خەڵقە رەش و رووتەی كە بە شمشێرە كولەكانیان و لەشە زەرد و زەعیفەكانیان لە دوورایی هەزاران كیلۆمەترەوە بۆ فیداكاری خۆیان هەڵدەكوتا چ سوود و بەرژەوەندیی دنیاییان لەو قوڕبەسەریەدا نەبوو".

بۆیە پێی وایە وەك چۆن هەڵوەستە زۆر باسكراوەكەی ئەللۆرد ئەلەنبی سەركردەی لەشكری ئینگلیز لە دوای داگیركردنی شام لە شەڕی یەكەمی جیهانیدا كە لەسەر قەبری سەلاحەدیندا وتی "ئەم زاڵبوونە درێژەی شەڕی خاچە) نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی كە شەڕی جیهانیی یەكەم و دووەم شەڕی ئاینی بووبن و دنیایی ئیمپریالیستی نەبووبن، ئاوایش بوونی دنیادۆست و هەلپەرست لە سوپای خاچپەرستەكاندا نابێتە بەڵگە لەسەر دنیاییبوونی هێرشەكە.

٢- نووسەر پێی وایە شەرمكردنی مرۆڤی دنیاویست لە دەرخستنی نیازی راستەقینەی خۆی و بەرگگرتنی بە توێژاڵێكی ئاینی، لەبەرامبەریشەوە شانازیكردنی بابای ئاینپەروەر بە هەر كردەوە و نیازێكی ئاینیی خۆی، بەڵگەیەكیترە لەسەر ریشەداریی هەستی ئاینی، "بۆچی كە حاجی دەچێتە حەج و یا نوێژكەر دەستنوێژ دەشوا و یا سۆفی قاچی شێخەكەی ماچ دەكا هیچیان خۆی ناچار نابینی وەك بابای

دنیاویست کارەکەی بشارێتەوە وە یا ئینکاری بکا و یا بەرگی دیکەی تێ وەرپێچێ؟!... لەشەڕی خاچیشدا ئەو کۆمەڵانەی بەناوی عیسا و شوێنە پیرۆزەکانی فەلەستین دەکۆشان و خۆیان بەخت دەکرد بەوپەڕی شانازییەوە و پڕبەدەم مەبەستە ئاینیەکانیان دەردەبڕی، (کەچی) سوودپەرستە دنیادۆستەکان سەد بەرگی درۆزنی تەفرەدەری بەهەڵەبەریان لەبەر تەما و حەزە بەدەکانیان دەکرد و هەرچی ڕێوییەکی سەر بە دنیای تێیاندا هەبوو بە نەخش و نیگاری دین دەیانڕازاندەوە وەك کە لەم رۆژانەدا دێن دەم و چاوی ناشیرین بە ماکیاژ جوان دەکەن... ئەگەر پارە و مڵك و عەبد و جاریە هاندەر بوونایە خۆ ئەو کەسانەی کە خەڵقەکەیان بەرەو شەڕ دەبرد زمانیان نەبڕابوو هاوار بکەن: هۆ خەڵقینە با بچین بۆ سووریە و فەلەستین و میسر خۆمانیان لێ دەوڵەمەند بکەین. جا ئەگەر خەڵقیان بەدوادا بهاتایە دیارە شەڕەکە بۆ دنیا بووە".

بۆیە نووسەر راشکاوانە دەڵێ "گێڕانەوەی شەڕی خاچ بۆ هۆی مادی و ئابوری و تەمای دنیایی کارێکی سافیلکە و سەراوییە و دژی هەموو راستیەکی مێژوویە".

### ٣- حەقیقەتی غەیب و حاڵەتە رۆحییەکان:

نووسەر لە دوو توێی قساندا لە چەند جێیەکدا ئاماژە بە حەقیقەتی هەبوونی خودا و جیهانی نابەرهەست و خەسڵەتە رۆحییەکانی مرۆڤ، بۆ نموونە سەبارەت بە زاراوەی بوونی هێزەکی (الوجود بالقوة-potential) واتە توانای شاراوە و دەرنەکەوتووی مرۆڤ کە دەرکەوتنی لەسەر کات و تەمەن وەستاوە (وەك توانای قسەکردن و سێکس لە منداڵدا) کە هەر یەکەیان لە قۆناغێکی پێشکەوتووتردا دەردەکەون، بوونی ئەو هێزە کە دەرکەوتنی دواخراوە دەبێ لە لایەن خاوەن بڕیارێکەوە دواخرابێ ئەگینا لە روانگەی نەبوونەوە ساتی ئیستا و دوای هەزاران و ملیۆنان دەقیقە و سەعاتیش هەر وەك یەکە "ئەو مادەی فەیلەسوفە مادییەکەی بۆ ئێمەیان باس کردوە لەخۆوە ناتوانێ لە پێشەوە مشوری ئەو بوونە هێزەکییە بخوات،

چونکە ئیرادە و ئیدراکی نییيە نە هەست بەخۆی بکات و نە خەریك بێت بەشتانەوە، واتە دواخستنی ئەو سیفەت و هێزانە بۆ کاتیکی ئایندە ئاماژە بۆ ژیرییەك دەکات لە پشت ئەو بڕیارەوە، مادەیش بێ گیان و ژیرییە —هەروەهاش خاسیەتی وەك زیندوێتی و ئیرادە و هۆش کە بوونی هێزەکییان لە مادەدا نەبوو، مومکینی نییە لـە هـەناوی مادەی مردوودا وردە وردە بە تێپەڕینی کـات برسـکێنیّ، چـونکە لـە نوختەنـەزەری (نەبوون)ەوە دەقیقەی ئێستاکە و دوای ئەو و دواتر و هەتا کۆتایی ملیۆنەها دەقیقە هەموویان وەك یەکترن، هیچ تاکێکیان ناتوانن شتێك پەیدا بکەن کە ئەوی بەر خۆی پێی پەیدا نەکرابوو دەنا دەبیّ بڵێین هێزێکی سیحری و غەیبی لەو تاکەیاندا هەبوو، کە ئەمە دژی هەموو بیرکردنەوەیەکی مادییە. ئەو فەیلەسوفانەی دەڵـێن مـادە لـە فلانە پلەدا و لە فلانە باردا قابیلیەتی (ژیان)ی لیّ پەیدا دەبیّ، سیفەتێکی نامەوجود بۆ مادەکە لە غەیبەوە دەخوازنەوە(ئەمەش جەرگەی میتافیزیکیەتە)"، دواتر دەڵیّ "فەیلەسوفی مادی کە نەسەلمینیّ (خوا) ئەو بوونە هێزەکییـەی لـە مـادەدا خـەلق کردووە دەبیّ بسەلمێنیّ کە ئەو مادەی ئێستا قسەی لیّ کـراوە هـەر بـەجاریّ لیـی هەڵناستیّ بەرە بەرە خاسـیەتێك لـە هـەناوی خۆیـدا بڕسـکێنیّ کـە پێـشتر وجـودی نەبووە"(٤٣)

## سێیەم: ڕۆڵی ئەرێنیی ئیسلام و زانایان و دامەزراوە ئاینیەکان:

مەسعود محەمەد خۆی بە لایەنگری ئایدیۆلۆژیایەکی ئاینی یان غەیرە ئاینی بڕیار نەداوە کە لە روانگە و چاویلکەی ئەوەوە شتەکان ببینێ و بخوێنێتەوە، هەروەها، ئاساییە کە لە خۆڕا خۆشی نەکردبێتە نەیاری هیچ فیکرە و ئایدیۆلۆژیایەك مەگەر بە لێکدانەوە و توێژینەوە دەرك بە زۆریی و زەقیی هەڵەکانی بکات. بەواتایەکی تر ئەوەی نووسەر لە روانگەیەکی سەربەخۆ و نالایەنگرەوە بۆ واقیع و مێژووی روانیوە و ئەو بەربەستە دەروونیەی رێ لە لایەنگرانی ئایدیۆلۆژیاکان دەگرێ دان بە لایەنە ئەرێنییەکانی بەرامبەرەکانیاندا نەنێن لای ئەو نەبووە، بۆیە ئەگەر دیمەنێك یان هەڵوێستێك یان بەهایەکی لەم یان لەو ئاییۆلۆژیا یان کەس و گرووپەوە دیبێ باسی کردووە، لێرەوەیە ئەگەرچی ئەو خۆی بە کەسێکی ئاینخواز دانەناوە و خۆی گوتەنی لە چەند مانگێك زیاتر سەری خوێندنی بە حوجرەدا نەکردوە وتەنانەت درێژەی بە نەریتی بنەماڵەکەی لە کردنەوە و وتنەوەی زانستە شەرعیەکان نەدا، بەڵام دەبینی هەڵوێستەکانی لەمەڕ زۆر مەسەلەی مێژوویی پەیوەندیدار بە ئەدەب و سیاسەت و ئاین و مێژوو جیاوازییەکی بەرچاوی هەیە لەگەڵ ئەو ئاراستە گشتییەی کە رۆشنبیرانی سەر بە فیکرەی چینایەتی و سیکیولاریزم لە کۆن و نوێدا گرتویانەتە بەر، کە هەمیشە لە چاویلکەی تەسکی فەلسەفە و ئایدیۆلۆژیا و حزبەکانیانەوە بۆ دیاردە ئەدەبی و مێژووییەکانیان روانیوە و راڤەیان کردوون و لەنێو ئەوانەدا وێنەی ئاین و زانایان و دامەزراوە ئاینیەکانیان بەشێوەیەکی سەلبی پێشان داوە.

مەسعود محەمەد دەڵێ "نووسەری مولتەزیم کە یەخەگیری مێژوو دەبێ بەزۆرەملێ دەیخاتە سەر زەوی و فەلسەفەکەی دەکا بە کفن و لەبەری دەکا، پێشت دەڵێ فەرموو سەیرکە فەلسەفەکەم چەند گونجاوە لەگەڵ مێژوو. من دەڵێم نابێ تیشکی فەلسەفە وەك شەوقی نیۆنی سەوز و سوور دەوروبەری خۆی بە رەنگی خۆی رەنگین بکا، دەبێ فەلەسەفە تیشکێکی بێ تەرەفانە بخاتە سەر واقیع تا راستی و نهێنییەکان دەرخا، ئەگەر وانەکا بەهەڵەمان دەبا"(٤٤).

ئەم بێتەرەفییەی نووسەر بووەتە مایەی ئەوەی نەسڵەمێتەوە لەوەی ئاماژە بە چەندین رووکاری گەش و ئیجابیی لە مێژووی ئیسلامی و کاریگەریی ئاینی ئیسلام لەسەر گەشەپێدانی باری رۆشنبیری و ئەدەبیی کورد و بەروپێدانی گیانی مرۆڤدۆستی و دادپەروەری لەناو رۆڵەکانیدا بدات، ئەمە لەکاتێکدا زۆرێك لە رۆشنبیرانی هاوسەردەمی ئەو گەر ئەو راستیانەشیان زانیبێ(لە نموونەی دۆستە کۆمیۆنیستەکە کە مەسعود محەمەد وتوێژەکەی لەگەڵ کردوە و پێشتر باس کرا) لە نووسینەکانیانا رایان نەگەیاندوە و دانیان پێدا نەناوە، چونکە ئەوان بێلایەن نەبوون و دان نانیشیان بەو راستیانەدا پێچەوانە وەستاوە لەگەڵ هەژموون و بەرژەوەندی و بنەماکانی فیکری و فەلسەفی و ئایدیۆلۆژییاندا، کە بەلایەوە ئاین تلیکی گەلان و چەکی دەستی چەوسێنەران بووە.

لەناواخنی نووسینەکانی مەسعود محەمەد دا لە چەندین جێ و بۆنەی جیاوازدا بەشێوازی جۆراوجۆر ئاماژەی بەسینەفرانی و لێبوردەیی و گشتگیری و گیانی ئازادیخوازی و مرۆڤدۆستی و هاقپەروەری ئیسلام کردوە و زۆر هەڵوێستی شۆڕشگێڕانە و پێشکەوتنخوازانەی ئاینەکە و پێشەوا و زانایانی بە نموونە دێنێتەوە و دەوری دامەزراوە ئاینییە کلاسیکیەکان (بەتایبەت خوێندنی حوجرەکان) لە برەوپێدانی زانست و ئەدەب و رۆشنبیری و یەکخستنی هەستی خەڵکانی پارچەکانی کوردستاندا بەئیجابی هەڵدەسەنگێنێ.

دەتوانین لە چەند تەوەرەیەکدا ئاماژە بەو بۆچوونانەی مەسعود محەمەد بکەین:

**١- هەستی ئاینی و نەتەوەپەروەریی شاعیر و رۆشنبیرانی کلاسیکی کورد:**

مەسعود محەمەد لە تەفسیرکردنی هەڵوێستی نەتەوەییانە و هەقدۆستانەی شاعیر و رۆشنبیرانی کلاسیکی کوردا، جیاواز لە زۆرێك لە رۆشنبیر و ئەدیبانی چەپ و ناسیونالیستی کورد کە هەوڵیان داوە ئەو هەڵوێستانە لە کاریگەریی هەست و پاشخانە ئاینیەکە دابڕن و بیگێڕنەوە بۆ هەستی چینایەتی یان ناسیونالیستیی دابڕاو

لە پاشخانی ئاینی، دوو خاڵی لەبەرچاو گرتووە تا بتوانێ لێکدانەوەیەکی دروست بۆ ئەو هەڵوێستان بکات:

١– وەك خووی بنەڕەتیی خۆی بێتەرەفانە و بە چاویلکەیەکی بێڕەنگ بۆ ئەو مێژووی ڕوانیوە.

٢– بەپێوەرەکانی عەقڵی ئەو سەردەمە و لە ڕوانگەی هەستی گشتیی و بەها باوەکانی ئەو قۆناغە مێژووییە تایبەتەوە هەڵوێستەکانی ئەو شاعیرانەی هەڵسەنگاندوە نەك بە پێوەرەکانی نیوەی دووەمی چەرخی بیستەم و باری فیکری و ئایدیۆلۆژی و سیاسی زاڵ بەسەر بارودۆخی ئەمەی دواییدا، بۆیە جیاواز لەو دووچینە ڕۆشنبیری باس کران، پێی وایە هەرکام لە شاعیرانی کۆن (لە نموونەی حاجی قادری کۆیی) پێش لەوەی هەر شتێك بووبن هەڵگری فەلسەفە و باوەڕی ئیسلامەتی بوون، ئەو هەستە شۆڕشگێڕی و نەتەوەپەروەری و دادخوازییەش کە تێیاندا بووە تەنیا هەستێکی ئاینی و باوەڕێکی پاکی ئیسلامەتی ناواخن بووە و لە ڕوانگەی جێبەجێکردنی فەرمانی شەریعەتەوە دژی کاری نەنگ و بەد وەستاون و هەوڵی هۆشیارکردنەوەی خەڵکیان داوە.

بۆ نموونە لەبارەی وەستانی مەلای ئیبوئادەم دژ بە ستەم و ڕەفتاری نەنگی خەڵك یان دەسەڵاتدار و کاربەدەستانی ئەو کاتە دەڵێ "ئەوەندەی بیستبێتم و زانیبێتم ولە کتێبی بایەخداردا خویندبێتمەوە بۆم ساغ نەبۆوە مەلای ئیبنو ئادەم کوردایەتی کردبێ بە واتای بزووتنەوە یان فەلسەفەیەکی قەومی. بەڵێ بەپێی ئەوەی کە مسڵمانێکی ڕاست بووە و لە خوا ترساوە و بڕوای بە قیامەت ترسی دنیای لە دڵا بردۆتە دەرێ، موکینە لە ڕێبازی ئەنجامدانی فەرمانی شەریعەتەوە بەرەنگاری کاری ناڕەوای حکومەتی ئەوسای بووبێ... جا ئەگەر عوسمانییەکان فەرمانڕەوا بووبن یەخەگیریان بووبێ و کەوتبێتە هەڵوەستی وەها لەڕێی مەفهومی بەرهەڵستیکردنی بێگانەوە لە ڕواڵەتدا شێویەیەکی کوردپەروەری وەرگرتبێ، بەڵام ئایا ئەو کارانە هەموویان کە لە پەراوێزی واتای ئاین دەرناچن تا بشلێی بەنرخ و پیرۆز و شەرافەتکارن، مومکینە پێیان بگوترێ کوردایەتی؟"(٤٥).

هەروەها پێی وایە کە پاشخانی فیکری حاجی قادری کۆیی کە یەکێ لە رێبەرانی شیعری نەتەوایەتیی هاوچەرخە، هەر پاشخانێکی ئاینی بووە و لەژێر کارتێکردنی ئایندا هەڵوێستی ئازادیخوازانە و نەتەوەپەروەرانە و دژایەتکردنی دەرەبەگ و زاڵمانی گرتۆتەبەر، نەك بەپاڵنەری هەستی چینایەتیی یان ناسیونالیستی. لەم بارەیەوە دەڵێ "وردبوونەوە و سرنجگرتنێکی ژیرانە لە هەڵبەستەکانی حاجی تێمان دەگەیەنێ پاشخانی سەقافەتی حاجی پاشخانێکی ئیسلامی مێشك کراوەیە کە پەندی لە داهێنان و دۆزینەوە زانستیەکانی ئەورووپای سەدەی نۆزدەم وەرگرتبێت و باوەڕی بە سوود و دروست بوونیان هێنابێت"(٤٦).

جا هەوڵ دەدات ئەوە بدۆزێتەوە ئایا لە شەریعەتی ئیسلامدا هیچی وەها هەیە خاوەن بیروڕایەکی موسڵمانی پتر لە سەد ساڵ پێش ئەمڕۆی وەك حاجی قادری کۆیی راستەوخۆ بخاتە سەر دوژمنایەتیی یەکێك لەو تاقمە کۆمەڵایەتیانەی بە زاراوەی نوێ پێی دەگوترێ چین؟ بە دەربڕینێکی دی ئایا ئیسلام پشتگیری لە بیرۆکەی چینایەتی -بە مانا مارکسییەکەی- دەکات تا بگونجێ حاجیش لەوە فیکرەی دوژمنایەتیی چینی دەرەبەگی وەرگرتبێ، یاخود حاجی قادی لە روانگەیەکیتری ناچینایەتییەوە دژایەتیی دەرەبەگی کردوە؟

نووسەر سەرەتا لەبارەی تێڕوانینی ئیسلام بۆ مەسەلەی جیاوازیی چینە کۆمەڵایەتیەکانی نێو کۆمەڵگە دەڵێ "فیکرەی داد لە ئیسلامدا لەسەر بناغەی چینایەتی هەڵنەستاوە... بێگومان ئیسلام دەوڵەمەندێکی نوێژکەری خۆشتر دەوێ لە هەژارێکی نوێژنەکەر، بەڵام گومان لەوەشدا نییە کە پتر لەسەر هەژار دەکاتەوە تا دەوڵەمەند هەرچەند لەسەرکردنەوەکە لە نوقتەی (دژایەتی دەوڵەمەند)ەوە سەری هەڵنەداوە چونکە ئیسلام سەر بەچینبوون و سەر بەرەگەزبوونی نەکردوە بە تاوان... لە هەمان کاتیشدا ئەمەی لە خۆی نەکردوە بە ئامانج دەوڵەمەند و زەویدار و دەرەبەگ هەتا قافی قیامەت دەبێ ئیمتیازەکەیان هەر بمێنێ، چونکە مەعلومە سوودی گشتی بەپێی کات و بار لە چدا بێت ئیسلام ئەوە بە یاسا دادەنێ".

دواتر لەبارەی پەیوەندیی ئەم فەلسەفەیە بە بیرکردنەوە و هەڵوێستەکانی حاجی قادرەوە دەڵێ "بێگومان لە سەرتاسەری شەریعەتی ئیسلام بە هەموو سەرچاوەکانی یاسادانانیەوە تاکە یەك رێچکۆڵە بەدەست ناکەوێ ببرێتەوە بۆ فیکرەی چینایەتی تاکو بەئومێد بین لە شەریعەتەوە مامۆستاییێك پەیدا بێت دوشمنایەتیی دەرەبەگ فێری حاجی قادر بکات" هەروەها پێی وایە "هاتنی قسەی هەژار دۆست وەیا ستەم نەویست لە هەڵبەست و نووسین خۆی لە خۆیدا نابێتە بەڵگەی بوونی فیکرەی چینایەتی لای خاوەنەکەی، چونکە بەزەیی بۆ هەژار و رق هەڵگرتن لە ستەمکار میراتێکی هەزاران ساڵی مرۆڤە".

لە کۆتایی وردبوونەوەکەیدا دەگاتە ئەوەی بڵێ "ئێمە چەندێکی خۆمان قووڵ بکەینەوە بۆ بنج و بناوانی فەلسەفەی ئیسلام بەنیازی وەدەست هێنانی بنگەییێکی فیکری کە یەکێکی ئازادیخوازی وەك حاجی قادر بەرەو خۆ دانە پاڵ(چین) ببات دەستمان بە شتێك ناگات جگە لە فیکرەی (داد)ی ئیسلامی... لەبەرئەمە چەندێکی خەریك بین لە لایەنی ئیسلامەتی حاجی قادرەوە فیکرەی چینایەتی لە هەڵبەستەکانی حاجی بدۆزینەوە هەر بە دەوری خۆماندا دەسوڕێینەوە بۆ ئەو سەرشارەی کە لە سەرتاوە لێی کەوتینە بزوتنەوەوە، ئەویش سەرچاری ئیمان وئەو مەفهومانەیە کە لەوەوە وەردەگیرێن"(٤٧).

مەسعود محەمەد تەنیا کۆششی دادویستانە و ئازادیخوازانەی مەلای ئیبنو ئادەم و حاجی قادری کۆیی بۆ کاریگەریی پاشخانە ئاینیەکەیان ناگێڕێتەوە، بەڵکو پێی وایە "هەموو شیعری کوردی بەر لە پەیدابوونی حزبە (چین پەروەر)ەکان لە کوردستاندا لە گۆشەنیگای دادپەروەری و فەرمانی ئاینیی پاکەوە بەرەو بەرهەڵستیکردنی کاری بەدەوە رۆیشتوون"(٤٨).

**** ****

### ٢- رۆڵی حوجرەكان و مەلایانی مزگەوت لە خزمەتی ئەدەب و رۆشنبیری و دۆزی كورددا:

مەسعود محەمەد جیاواز لە ئاپۆرەی رۆشنبیرانی ئەو سەردەمە –كە بەزۆری سەر بە فیكرەی ماتریالیزم و چینایەتی بوون– كە ئاین و دامەزراوە و زانستەكان و زانایانی ئاینیان بە هێما و نیشانە و سەرچاوەی دواكەوتن و نەهامەتی گەلی كورد دادەنا و بەچاوی سووك بۆ رۆڵ و پایەیان دەڕوانین، لە چەندین جێدا بە بایەخەوە باس لە رۆڵی ئاین و دامەزراوە زانستییە ئاینییەكان و زانایانی ئاینیی كوردستانی كردوە.

نووسەر باس لەوە دەكات كە شێوازی خوێندنی فەقێیایەتی لە سەرتاسەری كوردستانی گەورەدا لە مێژووی دوور و نزیكیدا رۆڵێكی گەورەی لە بەیەكەوە گرێدانی پارچەكانی كوردستاندا دیوە و برەوی بە هەست و هۆشی نەتەوەیی داوە، هەروەها مەدرەسە شەرعییەكان رۆڵی خوێندنگە و زانكۆ هاوچەرخەكانیان بینیوە و زانستە مرۆیی و كۆمەڵایەتیەكانیان تێدا خوێنراوە و سەرچاوەی گەشەپێدانی رۆشنبیری و ئەدەبی كورد و پێگەیاندنی چەندین زانا و ئەدیبی گەورە بوون كە بەهۆی پلە و پایەی زانستی و ئاینییانەوە پلەو پایەی گرنگیان لە ناوەندی زانستی و نێو دەسەڵاتی سەردەمی خۆیاندا گرتوە.

ئەوەی مەسعود محەمەد لە پەسنی رۆڵی حوجرە و زانا ئاینیەكانی كوردستاندا گوتویەتی لەنێو رۆشنبیرانی هاو ئاست و هاومەشرەب و هاوسەردەمی ئەودا شتێكی دەگمەنە و، بەو كارەی بەرگرییەكی بوێرانەی لەو دەزگا و كەسایەتییانە كردوە، كە ئەو بەرگرییەی هێندەی وەستانەكەی بەرووی چەپەكان و رۆشنبیریی چەپایەتی باڵادەستی ئەو سەردەمەدا تاكانە و سەیر بووە. رەنگە هەر لەو رووەشەوە بووبێ كە تۆمەتی "كۆنەپەرستی" دراوەتە پاڵ، وەك پێشتر لەسەر زمانی خۆی ئاماژەمان بۆ كرد.

مەسعود محەمەد لەو بارەوە لە بەشی یەكەمی (حاجی قادری كۆیی)دا باس لەوە دەكات كە "چەندین بنەماڵەی زانا بۆ ماوەی سەدان ساڵ شەوچرای

خوێندەواری و ئەدەب بوون و... تا رادەییێك باری بێ کیانیی و بێ هێزیی و هەژاری مەیللەتەکەیان راست کردۆتەوە... بێگانەیەك کە دەڵێ و دەنووسێ (قدوتنا و مولانا الشیخ خالد الکردي) بیەوێ و نەیەوێ تەواوێك لە گوتەی بێ حورمەت دەلێستەوە کە بێ شەرمانە لە کورد دەگیرێ"، هەروەها دەڵێ "هەر یەکە لەو مەلا و پێشڕەوانەی ئاین و تەریقەت و ئەدەب بەقەدەر قارەمانێکی میللی پشتگیرییان لە کورد کردوە بەچەکی زانست و مەعنای سەردەمی خۆیان... مەلایەتی لە شیعری تێکڕای شاعیرانی پێش قۆناغی نوێ دیمەنێکی تابلێی بەرچاوە... ئارایشت و زینەتی بەشێکی زۆر لە شیعری شاعیرەکان راستەوخۆ لە کتێب و زانستەکانی مزگەوتەوە هەڵدەستان... لە دیوانی حاجی قادردا چەندین هەڵبەست هەن زادەی کوتومتی مزگەوتن، وەك ئەویش هەموو ئەو شاعیرانەی مەلا بوون و بەدوایی شۆرەتی غەلەبەی لێ کردوون وەك نالی و مەولەوی و وەفایی و بێخود و صافی، ئەسەری خوێندنی مزگەوت لە سەرانسەری دیوانەکانیاندا دێتە بەر هەموو چاوێك"(٤٩).

جا لەبەرامبەر ئەوانەی بە چاوی سووك سەیری زانستەکانی ناو قوتابخانە شەرعییەکانی مزگەوت دەکەن وەسفێکی بەهێز بۆ رۆڵی ئەو زانستانە لە سەردەمی خۆیاندا دەکات و بە بەشێك لە زانستە گرنگەکانی مرۆڤایەتییان دادەنێ و زاناکانیشیان بە زانای گەورەی ئاین و زانست دادەنێ و، ئەو جۆرە کەسانەی بەو شێوەیە لە خوێندنی مزگەوت دەڕوانن بە "نابەلەد" ناو دەبات و پێداگریی دەکات لەوەی توانای مەلاکانی جاران بۆ سەردەمی خۆیان بەبەراورد بە توانای خوێندەوانی ئەمڕۆ زۆر پێشکەوتووترە و دەڵێ "خوێنەر وا تێنەگا خوێندنی مزگەوتان شتێکە و زانست شتێکی دیکەیە: بەر لە راپەڕینی زانستی نوێی ئەورووپا لە هەموو جیهاندا هەر ئەوە زانست بوو کەوا لە مزگەوتەکان بە دەرس دەگوترانەوە، تائێستاش لەنێو زاناکانی ئەورووپادا کە ناوی ئیبن سینا دێ وەك ناوی ئەنیشتاین هاتبێ وایە، مەعلومتە ئیبن سیناش مەلاییێکی زێدە گەورەی سەردەمی خۆی بووە. لەرووی نابەلەدیشەوە گەلێك لە گەنجەکانمان بەلایانەوە خوێندنی دین خوێندنی جەهلە، کەچی گومان لەوەدا نییە مامۆستای ئەو گەنجانەش نابن بە فەقێی باش لای مەلای

ئیبنوئادەم ئەگەر ئیمڕۆ زیندووبایە...بە تێکڕایی خوێندەواری ئیمڕۆی کورد بەراورد بکە لەگەڵ مەلاکانی لەمەوپێش و هەر لایە بەپێی زەرف و کاتی خۆیان هەڵیان سەنگێنە، بێگومان تەرازووی مەلاکان یەکجار سەنگینتر دەبێ... مەلاییکی کوردی ٤٠٠ ساڵ پێش ئەمڕۆ هاوتای خوێندەواری (نموذجي)ی سەردەمی خۆی بووە، واتە ئەو زیاتر کوڕی رۆژگاری خۆی بووە لە مامۆستاییێکی کورد... پیاوێکی وەك ئیبراهیم حەیدەری کە بوو بە شێخولئیسلام لە دوارۆژانی خەلافەتی عوسمانی مەلاییێکی هەولێری بوو، بەپێی دەوری خۆی پایەییێکی نەهێشتەوە لە رەوتی زانیاری و ئاینی و جیهانی کە بۆ مەلاییێك مومکین بێ لێی سەرکەوێ.لەو دەمەدا ئەم مەلایە لە رووی هێز و دەسەڵات وناوو مەقامی رۆشنبیرییەوە چەندین مەیدان لە پێش خوێندەوارانی ئیمڕۆی کوردەوە دێ بەپێی کاتی خۆیان، پایەی شەیخولئیسلام لەوە بەرزترە یەکێك بگا بە پایەی پاداشتی نۆبڵ، خۆ دیارە تا ئێستا تاکە کوردیك نە ئەو پاداشتەی وەرگرتوە نە لە دوارۆژیکی بەرچاویشدا بەتەمایە وەریگرێ... خوێنەوارێکی دووسەد ساڵ لەمەوبەری کورد کە دەبوو بە پێشەوا لە مەیدانی رۆشنبیریدا شەهادەکەی لە فێرگەییێکی کوردستان وەردەگرت و لزومی نەبوو بەوە لە پێناویدا بچێ بۆ دەرەوە"(٥٠).

دواتر ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە چۆن دیاردەی خوێندنی حوجرە و مزگەوتەکان لە کۆمەڵگەی کوردەواریدا لە هەمو نەتەوە موسڵمانەکانیتر زیاترە و ئەمەش بووە بە مایەی ئەوەی زانایانی کورد لە هاوپیشەکانیان لە نەتەوەکانیتر لەو سەردەمەدا پێش بکەون و دەڵێ" ئەم خوێندنە وەك لە کوردستاندا بە دەشت و شاریەوە باوەشی بۆ کرابۆوە نە لە نێو تورکان و نە عەرەبان و نە فارسان تا ئەوەی بزانم نە هیچ میلەتێکی دیکەی ئیسلامدا هێندە خۆش ئامەدیی لێ نەکراوە... ئەم زاهیرەیە وا بووە سرنجی نووسەری غەیرە کوردیشی لێرە بەپێشەوە راکێشاوە، یەك لەمانە نووسەری تورك "رضا توفیق" لە کتێبی "مفصل قانون الفلسفة" قسە نەقڵ دەکا لە (میزان الحق)ی حاجی خەلیفە کە دەڵێ: زانستەکانی فەلسەفی لە رێی فەقێیەکانی کوردی کوردستانەوە لە تورکیادا ژیانەوە"(٥١).

شانازیکردنی خۆیشی بەناوو شۆرەتی زانا و شاعیرانی کورد کـە دەرچـووی ناوەندە زانستییە ئاینیەکە بوون ناشارێتەوە و دەڵێ "من لە سرنج و تێفکرینم لەگەڵ خۆمدا، بەوپەڕی سادەیی و بێ تەمسیلیەوە، هەستی لەخۆ رازیبوونم دەجـوڵێ کـە دەبینم نالی و شێخ رەزام لـە ریـزی هـەرە پێشەوەی شـاعیرانی ئیـسلامەوە دێـن... مەولانا خالید و کاك ئەحمەدی شێخ شان بەشانی گەیلانی و شاهی بوخارا دونیـای تەسەوفم بۆ دەگەڕێن... ئیبنو ئادەم و ئیبنو حاجیب بـە قـەدەر (عـچد و شـریفی و جرجانی) لە مەلایەتیدا پێشەوان... بەشێکی زۆر لە خەفەتم دەرەوێتەوەبـەو چـرایە گەش و تریفەدارانە کە لە بنگەکانی ئاینی وزانیاریی کوردستانی کۆنەوە بە تیـشکی چاو خیبرەکەیان عەیبی هەژاری و بێ دەسەڵاتی و بێ کیانیی کوردم بۆ دادەپۆشن".

لـەم تیڕوانینــەوە مەسـعود محەمــەد بەگژاچـوونەوە و سـووك کردنـی زانـا ئاینیەکانی کۆنی کورد بە "خۆ خنکاندن" لە قەڵەم دەدات کە دڵی ناحـەزانی کـورد خۆش دەکات و دەڵێ "بەراستی کوژاندنەوەی ناو و روەت و شۆرەتی چراکانی زانست و ئاین و ئەدەب لە مێژووی کورد ئەو کارە خۆ خنکێنەیە کە ناحەزی کـورد حـەزی پێدەکا و چاوەنۆڕیەتی"(٥٢).

مەسعود محەمەد لە کتێبی (اعادة التوازن الی میـزان مختـل)دا رۆڵێکیدیکـەی گرنگی حوجرەکانی کوردستان و خوێندنی فەقێیەتی باس دەکات، کە ئەویش بریتییە لەوەی لەکاتێکدا کورد بەدرێژایی هەزاران ساڵ بۆی رێك نەکەوتوە لـە چوارچێوەی کیانێکی نەتەوەیی یەککرتوودا کۆ ببێتەوە کە خەڵکی هەموو ناوچەکانی لەسەر یەك شێوە گوزەران و رەفتاری کۆمەڵایەتی بژین و بەهایەکی نەتەوەیی و داب و نەریتێکی گشتییان بۆ دروست ببێ و کەرەسـتە و ئـامرازی بەیـەك گەیـشتن و پێکـەوەژیان و ئاڵوگۆڕی بەرژەوەندییەکانیان نەبووە و قەت رێ نەکەوتوە بەرژەوەنـدییێکی گـشتی هەموویان بجولێنێ و بیانکاتە یەك ریز، ئا لەم کاتـەدا گـەڕان و سـوڕانی فـەقێکانی کوردستان بە گوند وشارەکانی پارچە لێك دابڕاوەکانی کوردستاندا "شتێك لە پێکەوە بەندبوونی نەتەوەیی بۆ هێشتۆتەوە ئەویش بەهۆی بڵاویـی خوێنـدنی مزگەوتـەکان بوووە کە پتر لە هەزار ساڵە لە شارو گوندەکانیدا بڵاون و هەزاران فەقێ چوارقوڕنەی

کوردستان بەشوێن خوێندنی زانستە ئاینییەکان و دۆزینەوەی زانایانی لێهاتوودا گەڕاون و بەمە (هاوڕێگەیی) چەند هاوەڵێکی (فەقێی) لە هەموو ناوچە کوردییەکان کۆکردۆتەوە و وا بووە ژووری مزگەوتێك لە مزگەوتەکانی جێیەك فەقێی هەر چوار پارچەکەی کوردستانی تێدا کۆ بوەتەوە و پێکەوە ئاڵوگۆڕی فیکر و قسە و عادەتیان کردوە و، هەریەکەیان بووەتە سەفیری ئەو شوێنەی لێی هاتوە و کە گەڕاوەتەوەش بووەتە سەفیری هەموو ئەو خەڵکەی لە مەملەکەتەی لێی خوێند لەگەڵیان ژیانی بەسەر بردوە لای ئەو شوێنەی کە وەعزی تێدا کردوە"(٥٣)

### فتواکەی مەلای خەتێ

یەکێك لەو رووداوانەی دەمێکە لە لایەن رۆشنبیرانی نەیار بە بوون و رۆڵ و کاریگەریی ئاینەوە دەوروژێنرێ و دەکرێتە بەڵگەی ئەوەی ئاین و پیاوان و دامەزراوەکانی نەخشێکی خراپیان لە مێژووی کورد و بزوتنەوە شۆڕشگێڕی و ئازادیخوازییەکەیدا هەبووە فتواکەی مەلای خەتێیە.

فتواکەی مەلای خەتێ – وەك سەرچاوە مێژوویەکان باسی دەکەن– بریتیە لەو فتوایەی مەلا خەتێ ئەفەندی، کە مەلای رواندوز بووە لە سەردەمی میرمحەمەدی رواندوز ناسراو بە (پاشای کۆرە) لە سەدەی نۆزدەدا لەکاتی شەڕی نێوان سوپای دەوڵەتی عوسمانی و لەشکری میر محەمەددا داویەتی، کە هەر کوردێك لە دژی لەشکری خەلیفە بجەنگێ کافرە و بەمە –بەپێی ئەو گێڕانەوانە– لەشکرەکەی میر محەمەد لە شەڕ وەستاوە و شەڕ بە سەرکەوتنی لەشکری عوسمانی و لەگۆڕنانی خەونی سەربەخۆیی کوردستان لە بیری میر محەمەد و هاوەڵانیدا تەواو بووە.

مەسعود محەمەد لە چەند جێیەکدا، بۆ نموونە لە بەشی دووەمی حاجی قادری کۆیی و هەروەها لە کتێبی (اعاده التوازن)دا دێتە سەر لێکدانەوەی ئەم باسە و بەگشتی پێی وایە مەلای خەتێ ئەو فتوایەی داوە بەڵام نەك دژ بە ویستی پاشای کۆرە، بەڵکو فتواکە لەسەر ویستی پاشای کۆرە خۆی دەرچووە نەك لەدژی، واتە "مەلای خەتێ بەپێی بەرژەوەندییەك کە پاشای کۆرە رەچاوی کردوە، بۆ ئەوە هەم وڵاتەکە وێران نەبێ و هەم ئابرو نەتکێ بەپەلە و دواکات فەتوای رەوانەبوونی ئەو شەڕەی دەرچواندوە تا ببێتە هۆی ئیمکانی گێڕانەوەی لەشکری کورد بۆ رواندز و کردنەوەی دەرگایەکی ئاشتی و رێککەوتن".

نووسەر ئەم بۆچونە لەسەر زمانی پیاوێك دەگێڕێتەوە کە خەڵکی ناوچەکە بووە و شارەزای رووداوەکانی سەردەمی پاشای کۆرە بووە، ئەم قسانەیشی، بەگوتەی نووسەر، لە رووی گێڕانەوەی راستییەوە بووە ئەگینا "ئەو پیاوە هیچ خزمایەتی یا دۆستایەتی لەگەڵ بنەماڵەی خەتێ نییە و بەپێچەوانەوە لەلایەن

مەشرەبی تەسەوفەوە دەبێ بە ناحەزی مەلای خەتێ بژمێردرێ"، واتە نووسەر لە بابی "الفضل ما شهدت به الاعداء"ەوە پێی وایە ئەو بۆچوونە راست و دروستە.

مەسعود محەمەد خۆیشی بە دوو بەڵگە لە لێکدانەوەی خۆی پشتگیریی لە راستیی ئەم بۆچوونە دەکات: یەکێکیان ئەوەیە "لە سەرەتای دانانی مەلای خەتێ بە (باش مەلا) و مەرجەعی ئاینی لە قەڵەمڕەوی پاشای کۆرەدا رێك کەوتنێك و پەیمانێکی بنجی و سەرەتایی هەبووە لەنێوان پاشا و مەلادا کە دەخلیان بە کاری یەکترەوە نەبێ"، بەم پێیە پێی وایە ریی تێناچێ مەلای خەتێ بەبێ رەزامەندیی پاشای کۆرە ئەو فتوایەی دابێ.

دووەمیان ئەوەیە "پاشای کۆرە لە حوکمڕانیی خۆیدا دەستی نەپاراستوە لە کوشتن، گومانی لە هەریەکێ کردبێ کوشتویەتی، بەر لە هەموو خەڵق مامەکانی خۆی کوشتون. دەوجا پیاویکی وا... چۆن دەستەپاچە رادەوەستێ لە عاست مەلای خەتێ کە خەریك بێ کارێکی وا بکات تەخت و تاجی لێ تێك بدات؟ مەلای خەتێش کە شارزای خوێنرێژیی پاشای کۆرەیە چۆن دوای ئەو فتوایەی هەڵنەهات بۆ جێگایەیەك خۆی تێدا بپارێزێ تا ئەو کاتەی ئیشی پاشا یەکلایی دەبێتەوە؟ وەك دەزانین نە پاشا مەلای کوشت و نە مەلاش ترسا لە کوشتن، چونکە فتواکە لەسەر ئارەزۆ و پەسەنکردنی پاشا بووە".

هەروەها دەڵێ "حاجی قادر کە لای مەلای خەتێ خوێندوەتی بەوبەیتەی کە دەڵێ:

تا تەعیناتی کۆر و لاڵ مابوو
لە گەلێ دێیەکان مەلای چا بوو

بەم بەیتە زیمنەن پاکانەییك دەکا بۆ مەلای خەتێ... پاکانەکەی لەوەوە دێ کەوا مەعلوم بەدوای مەلای ئیبنو ئادەمدا یەکەم مەلا لە تەعیناتی پاشای کۆرە سوودی وەرگرتبی مەلای خەتێ بوو. بەو پێیە ئەو بەر لە هەموو مەلایێك دەکەوێتە

ناو پەراوێزی قسەی حاجی... جگە لەمە حاجی و باپیرم لە مزگەوتی مەلای خەتێ خوێندیانە، گریمان لەو کاتەدا بیریان نەپژابوو فەتواکە لە مەلای خەتێ بە عەیب بگرن خۆ دوای چوونی حاجی بۆ ئەستەنبوڵ و کرانەوەی هۆشی میللەتپەروەرانەی دەبووو فکرێك لەو فەتوایە بکاتەوە و... شتێك لەو بارەیەوە بڵێ"، لەبەرئەوە پێی وایە "بێ عەیبیی فتواکە وای کردوە پیاوێکی کوردپەروەری وەك حاجی قادر رەخنەی لێ نەگرێ"(٥٤).

هەر لە میانی ئاماژەکردنی بە رۆڵی ئیجابیانەی زانایانی ئاینی، نووسەر لە هەردوو کتێبی (گەشتی ژیانم) کە بیرەوەرییەکانی خۆی تێدا نووسیوەتەوە و (حاجی قادری کۆیی)دا دوو رووداو دەگێڕێتەوە کە هەڵویستی جوانمەردانە و هەقپەرەوەرانەی هەندێ لە مەلاکانی کورد دەردەخات کە چۆن لەپێناو وتنی راستیدا گیانی خۆیانیان خستۆتە مەترسییەوە و دژ بە ویستی دەسەڵات وەستاون.

وەك نووسەر دەیگێڕێتەوە، یەکێکیان لە ساڵی ١٩٦١ بووە، دوای بەرپابوونی شۆڕشی ١١ی ئەیلول عەبدولکەریم قاسم داوای لە مەلایانی کۆیە کردوە بروسکەی پیرۆزبایی بۆ بنێرن و شۆڕشگێڕەکانی کوردی تیدا تاوانبار بکەن "دە مەلا بەوپەڕی سەربەزییەوە رەفزی خواهشتی میریان کرد و چوونە بەندیخانە و دووچاری زەحمەتێکی گەورە بوون و کەسیش نەیدەزانی سەرنجامیان بەچی دەگات".

رووداوەکەیتر لە ساڵی ١٩٦٦دا بوو، عەبدولسەلام عارف لە ئاهەنگێکی دینیدا مەلاکانی لە بەغدا کۆکردبۆوە و داوای لە مەلاکانی کورد کردبوو لە رادیۆ قسە بە شۆڕشی کورد بڵێن... بەڵام یەکێك لەو مەلایانەی کورد کەرتی وشەیەکی لە زار دەرنەچوو عەبدولسەلام پێی خۆش بێ ، تێکڕایان داواشیان لە حکومەت کرد ئاشتی بنێتەوە لەگەڵ شۆڕشگێڕانی کورد(٥٥).

**** ****

### ٣- ئاماژە بە گیانی لێبوردن و دادگەری لە ئاینی ئیسلامدا:

بەش بە حاڵی خۆم و لەو هێندە نوسینانەی مەسعود محەمەد کە خوێندونمەتەوە نایەتە بیرم خۆی بە مەسەلەی ناکۆکیی عەلمانیەت و ئیسلامیەت خەریك کردبێ و بەم یان بەو باردا دایشکاندبێ، بەڵام بەتێگەیشتنی خۆم ئەو لە عەلمانیەت نێزیکتر بووە، بەڵام ئەمە رێی لەوە نەگرتووە کە جیاواز لە رۆشنبیرە عەلمانییە چەپ و ناسیونالیستەکانی کورد بەبێ ترس و وەك بەشێك لەو بابەتانەی سەرنجی راکێشاون و بەپێویستی زانیوە بیاندرکێنێ باس لە بەها مرۆییەکانی ئیسلام، وەك دادگەری و فرەبایەخی و لێبوردەیی بکات، تا ئەو رادەیەی هەندێ جار لە سروشتی گوتاری ئیسلامی نزیك دەبێتەوە.

بۆنموونە لە میانی رەخنەگرتنی لە راڤەی تاکڕەهەند (احادی)یانی ماتریالیزم بۆ مێژوو باس لەوە دەکات ئەگەرچی لای موسڵمانان ئیسلام دینی خوایە، واتە راستیی گومان هەڵنەگرە، کەچی هێشتا ئیسلام بواری بە جیاوازیی بیروڕاو ئیجتیهاد و تێگەیشتن داوە و لەم روانگەوەیە کە چەندین مەزهەب لە ناو ئیسلامدا دروست بوون و هەر یەکەیان خاوەنی دید و تێگەیشتن و لێکدانەوەی خۆیەتی بۆ دەقەکانی شەریعەت، بێئەوەی هیچیان لە چوارچێوەی شەریعەت دەرچووبن.

هەروەها لە باسکردنی تەسکبینیی ماتریالیزمدا لە لاپەڕە ٨٤ی کتێبی (اعادة التوازن الى ميزان مختل)دا باس لەوە دەکات کە ئیسلام رێ بە دینەکانیتر دەدات لەژێر قەڵەمڕەوی ئەودا بژین کەچی ماتریالیزم هەر کە دەسەڵاتی وەرگرت رێ نادات بە بوونی غەیری خۆی نادات

لەم بارەوە دەڵێ "دینی ئیسلام لە مەیدانی خۆیدا نەیگوت خوانەناسین بە هەموو بارێکدا هەر ناڕەوایە، بەڵکو ناڕەوابوونەکەی بەستەوە بەهاتنی پیغەمبەران و بەردەوامبوونی خەڵقەکە لەسەر خواپەرستن (وما كنا معذبين حتى نبعث رسولا)، هەر بۆیەش بۆ دواتر کە دەسەڵاتی گرتە دەست رازی بوو بەوەی هەموو دینە ئاسمانییەکان لە سێبەی ئیسلامدا بەرانبەر بە جزیەدان بەردەوام بن چونکە دانی بەوەدا دەهێنا کەوا کاتی خۆی لە داهاتنیاندا (رەوابوون) هەبووە، کەچی وەك دەزانین

فەلسەفەی ماتریالیزم کە دەسەڵاتی گرتە دەست رازی نیە غەیری خۆی یەك دەقیقە نەفەس هەڵێنێت"(٥٦).

لەبارەی هەڵوێستی ئاینی ئیسلامیش لە کێشە و ستەمی چینایەتی و جیاوازیی هەژار و دەوڵەمەند و دادپەروەری کۆمەڵایەتی دەڵێ "لە هەموو ئەورۆژگارانەدا کە شەریعەتی ئیسلام بەراستی و دروستی لەکاردا بووە هەمیشە کات دادگەی ئیسلام بەیەك چاو سەیری گەورە و گچکە و هەژار و دەوڵەمەند و پاشا و گەدای کردوە، تەنانەت یەکێکی وەك (جبلة بن الایهم) کە لە ئیسلامەتی هەڵگەڕایەوە لەوەوە بوو کە نەیتوانی مەبدەئی یەکسانی و بێفەرقی نێوان مەردم تەحەمول بکات وەك کە خەلیفەی دووەم (عومەری کوڕی خەتاب) پێڕەوی شەریعەتی دەکرد".

دواتر بەشێوەیەك وەسفی بەهای دادگەری و یەکسانیی لە پەیوەندیی بە جیاوازیی نێوان هەژار و دەوڵەمەند و ئازادی و یەکسانیی مرۆڤەکان لە ئیسلامدا دەکات و بەسەر فەلسەفە هاوچەرخەکانیتریدا هەڵدەبڕێ هەر دەڵێی ئەو گوتەیە کەسێکی ئیسلامیی ئەم سەردەمە گوتویەتی. مەسعود محەمەد راشکاوانە دەڵێ "بەراستی ئەو داد و یەکسانییەی لە سێبەری شەریعەتی ئیسلامیدا بەکارهێنراوە لە رووی فەرقنەبوونی هەژار و دەڵەمەندەوە لە هیچ رژێمێکی ئەم رۆژگارە، چ ئەوانەی پێیان دەڵێن لیبەراڵ چ ئەوانەی پێیان دەڵێن پرۆلیتاری بەدی ناکرێت، ئیمکانی بەدیکردنیشی نییە. من ئەمە باوەڕمە و بەسەراحەت دەری دەبڕم"، هەرچەند دێڕێکیش دوای ئەوە دەڵێ "سرنج لە قسە زۆر مەشورە نرخدارە جوانمەردانەکەی خەلیفەی دووەم (عمری کوڕی خطاب) بگرە کە گوتی: (کیف استعبدتم الناس وقد ولدتهم امهاتهم احرارا) چەند بە سەراحەت و بەشێوەیەکی دلێرانە ودلگەرمانە دژی بەندایەتیە.لەگەڵ ئەمەشدا کەس ناتوانێ بلێ قسەکە لە هەستێکی (چینایەتی)ەوە هەڵستاوە، چونکە زۆر ئاشکرایە ئەم قسەیە و گەلێك ئاکار و کرداری تری خەلیفە عومەر بەرەوپێش بردنی فکرە و بنگەی دادپەروەریی ئیسلامەتییە لە چارچێوەی کۆمەڵایەتیی ئەوسای بەرەو گۆڕاندا... بێگومان هەڵوێست و بیروڕاکانی (ابوذر الغفاري) کە دادخوازی ئەوسایان لێ وەتەنگ دەهات، ئەوانیش هەر زادەی

ده‌روونێکی دڵسۆزی هه‌ژاردۆستی سته‌م نه‌ویستن بوو که پشت ئه‌ستور بێ به فه‌لسه‌فه‌ی قورئان و حه‌دیس له گوڕی تازه داهاتنیاندا"(٥٧).

مه‌سعود محه‌مه‌د هه‌روه‌ها ئاماژه به‌وه ده‌کات که شه‌ریعه‌تی ئیسلامی له خه‌می دانانی به‌رنامه و رێگه‌چاره‌دا بووه بۆ گشت ئه‌و کێشانه‌ی رۆژانه دێنه رێی مرۆڤ به راده‌یه‌ك ئه‌سته‌مه رۆشنبیری سه‌رده‌می نوێ ته‌نانه‌ت بتوانێ به دیراسه‌کردنی سه‌رجه‌م ئه‌و یاساکارییانه‌ی شه‌ریعه‌تی ئیسلامی بۆ بواره جۆراوجۆره‌کانی داناوه، بگات "بێگومان شه‌ریعه‌تی ئیسلام یاسای بی که‌له‌به‌ری داناوه بۆ هه‌موو ئه‌و شتانه‌ی که به‌لای ئه‌وه‌وه چاکن یا خراپن... یه‌کێك له رۆشنبیرانی سه‌رده‌می نوێ بتوانێ ده‌ریا و ده‌ریای کتێبی شه‌ریعه‌ت بخوێنێته‌وه، که به‌وپه‌ڕی وردی و به‌رینی و قووڵییه‌وه له هه‌موو سه‌روبه‌رێکی ئاده‌میزاد دواوه له‌و لایه‌نانه‌وه که به‌پێی باوه‌ڕی ئیسلام جێی خۆیه‌تی یاسای بۆ دابندرێ، سه‌ری له‌وه‌دا سوڕ ده‌مێنێ که ئه‌م هه‌موو ورده‌کارییه چۆن کراوه و له کوێ ئه‌م هه‌موو لێکدانه‌وه و به‌راوردکردنه و ده‌ستوورانه و لێکۆڵینه‌وه و هه‌ڵێنجانه و پاڵاوتنه هه‌ڵقوڵیوه، که له ته‌ك ئه‌ودا که‌م کاری عه‌قڵی و قانونی ئه‌م سه‌رده‌مه خۆی ده‌نوێنێ"(٥٨).

## چواره‌م: وه‌رگرتنی ده‌سته‌واژه و زاراوه ره‌وانبێژیه‌کان له ده‌ربڕیندا:

مه‌سعود محه‌مه‌د وه‌ك خۆی باسی ده‌کات گه‌رچی له سێ مانگ زیاترسه‌ری خوێندنی به مزگه‌وت و خوێندنی فه‌قێیه‌تیدا نه‌کردوه، به‌ڵام ره‌نگه به‌حوکمی عه‌ره‌بیزانییه قووڵه‌که‌ی و سه‌روکاریی له‌گه‌ڵ سه‌رچاوه‌کانی فیکر و رۆشنبیریی عه‌ره‌بی و ئیسلامیدا بێ که دیارده‌یه‌ك له نووسینه‌کانیدا هه‌ست پێ ده‌کرێ که من خۆم مه‌گه‌ر به ده‌گمه‌ن ئه‌گینا له هیچ نووسه‌رێکیتری سێکیولار و ناسیونالیستیی سه‌رده‌می مه‌سعود محه‌مه‌د و ئێستایشمدا نه‌دیوه، ئه‌ویش په‌نابردنی به‌رچاویه‌تی بۆ به‌کارهێنانی ده‌سته‌واژه و ده‌ربڕینه ره‌وانبێژییه‌کانی نێو ئایه‌ته و فه‌رموده‌کان یان هاوشێوه‌ی ئه‌وان له‌نێو نووسینه عه‌ره‌بییه‌کانیدا وه‌ك جۆرێك له جوانکاری و ره‌وانبێژی له نووسیندا، بۆ نموونه ته‌نیا له کتێبی (اعادة التوازن الى ميزان مختل)دا

ئەم بڕگە و دەستەواژانە بەجۆرێك لە جۆرەكان لە قورئانەوە وەرگیراون و تێهەڵكێشی نووسینەكانی كراون (لا یاتیها الباطل من بین یدیها ولا من خلفها لا ٦/ عالیها سافلها لا٧/ على رؤوس الاشهاد لا ٧/ ان الحسنات یذهبن السیئات لا ٩/ الطائر في عنقه لا٢٥/ ضربة لازب لا ٣٣/ الى یوم یبعثون لا ٤١/ لكان حتما مقضیا لا ٤٨/ طرائق قددا لا٥٦/ سم الخیاط لا ٨٣/ ذات الیمین و ذات الشمال لا ١٠٢/ لا تثریب علیها لا١١٢).

ئەمانە هەموویان بڕگەن لە ئایەت و دەقی ئاینی كە لە هەندێ جێدا بە پیتێك یان زیاتر دەسكاری پێكهاتەكەی كراوە.

## دیداریك بۆ یەكەم و دوا جار

دەمێك بوو تامەزرۆی ئەوە بووم لە نزیكەوە نووسەری گەورە مەسعود محەمەد ببینم تا لەپاڵ نووسینەكانیدا، كە بەتەواوی سەرنجیان راكێشابووم، بە گفتوگۆ و قسەكردنیشی ئاشنا بم و ئەو وێنەیەی لە رێی بۆچوونەكانی نێو نووسینەكانیەوە لام دروست بووبوون بچێتە قالبی راستەقینەی خۆیەوە و لەوە تێبگەم ئایا جۆری بیكردنەوە و ئاراستەی فەلسەفیی نووسەر تا چەند لەگەل ئەو وێنە گریمانەییەدا رێك دێتەوە كە من بەهۆی هەندێ لە بۆچوونەكانی نێو كتێبەكانیەوە لام گەلاڵە بووبوو.

ئەوە بوو لە١٩٩٧/١١/٧دا لەو كاتەی مەسعود محەمەد لە بەغدا بۆ سەردان گەڕابوویەوە هەولێر لەگەڵ برادەرانی دەستەی نووسەرانی هەفتەنامەی (یەكگرتوو) لە ماڵەكەی خۆیدا سەردانمان كرد، كە ئەوە یەكەم و دواجار بوو لە نزیكەوە بیبینم.

ئەوەی لەو دیدارەدا لە كەسایەتی و جۆری بیركردنەوەی مەسعود محەمەد تێگەیشتم ئەوە بوو، ئەو كەسێك بوو باوەڕی بە توانانی مرۆڤ و زانست هەبوو لە دۆزینەوەی راستیەكانی گەردوون و بۆچوونەكانیشی لەبارەی لایەنە ئاینییەكەوە بێ پەیوەندی نین بەو فەلسەفەیەوە، ئەو گوتی "رۆژێك دێت هیچ شتێك نامێنێ كە زانست كەشفی نەكات، رەنگە قیامەتیش هەر ئەو كاتە بێ كە هیچ نامێنێ كەشف بكرێ".

لەو دیدارەدا تێگەیشتم كە ئەوەی مەسعود محەمەد لەبارەی ئاینەوە گوتوێتی لەوە زیاتر نییە كە لە ئەنجامی وردبوونەوە و رامانی لە لایەنەكانی بیركردنەوەی مادی و بەراوردكردنی لەگەڵ رووداوەكانی ژیانی مرۆڤ و لە كۆن و نوێدا هەندێ لە لایەنە گەردوونی و كۆمەڵایەتی و مێژوویەكانی پێوەند بەئاینیش وەك بەشێك لەو وێنە و بەڵگانەی گومان لەسەر راستیی بیركردنەوە مادیەكە دروست دەكەن دەركەوتوون و، نووسەر بە رووی ماتریالیزمیدا داون، ئەگینا ئەو بەو جۆرە و بەو مەبەستە ئەو بۆچوونانەی دەرنەبڕیوە كە بێت لە روانگەی باوەڕێكی پێشوەختی خۆی بە ئاین، وەك كەسێكی موسڵمان، باس لە لایەنە گەشاوەكانی ئاین بكات لە

بەرامبەر لایەنە لاوازەکانی مادییەتی مێژوویی، وەك کە بیرمەندێکی ئاینی ئەوە دەکات.

ڕەنگە نووسەر خۆیشی لەکاتی نووسینی ئەو بیروبۆچوونانەیدا کە ئێمە کردوونماتە بابەتی ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەوەی بەخەیاڵدا نەهاتبێ کە ڕۆژێك بێت هەندێ لە خوێنەرانی بەو شێوەیە لەو بۆچوونانەی تێدەگەن و بۆچوونەکانی دەخرێنە سیاقێکەوە کە ئەو بەخەیاڵیدا نەهاتوە و ڕەنگە نەشیویستبێ بەو ئاقارەدا بچن، بەڵام ئیدی ئەو نەویستن و بەخەیاڵدانەهاتنە ماف لە ڕەخنەگران و خوێنەران ناسەنێتەوە کە بەچاوپۆشین لە کەسایەتی و ویستی نووسەر خوێندنەوە بۆ دەقەکانی بکەن، بەو مەرجەی بۆچوونێك بەزۆرەملێ بەسەر ئەو دەقانەدا دانەبڕن کە لە ڕووی دەلالەتی زمانەوانی و زاراوەییەوە بەرگەی نەگرن.

کاتێ لە دانیشتنەکەدا پێم گوت من بابەتێکم نووسیوە بەناونیشانی "ئاین لە فیکری مەسعود محەمەد"دا بەسەرسوڕمانەوە وتی "جا من چیم لەبارەی ئاینەوە وتوە تا کتێبی لەسەر بنووسرێ؟"، بەڵام نە پرسیاری کرد چیم نووسیوە و نە داوایشی کرد بابەتەکەی بۆ بنێرم، هەستم کرد ڕەنگە وەك جاران حەوسەڵەی خوێندنەوە و بەدواداچوونی نەمابێ.

لەگەڵ خۆم کۆمەڵێ پرسیارم ئامادە کردبوو کە حەزم دەکرد مەسعود محەمەد وەك دوا لێکدانەوەی بۆ ئەو بابەتە فیکرییانە وەڵامیان بداتەوە، کە تایبەت بوون بە تێگەیشتنی ئەو لە واتا و بایەخی ئایدیۆلۆژیا و ئاین و پێوەندیی نێوان ئەو دوو چەمکە و، ئایندەی ئەو چەمکانە لە سەردەمی نوێدا و تێڕوانینی بۆ ئیسلام و بزاڤە ئیسلامییەکان و جیهانگەرایی و تاکجەمسەریی جیهان و لیبرالیزم و کۆتایی مێژوو و...هتد، کاتێ خواحافیزیمان کرد پرسیارەکانم دایە دەستی و داوام لێکرد وەڵامیان بداتەوە، بەڵام مچەند هەفتەیەك تێپەڕی هەر وەڵامی نەبوو.

ناچار بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ کرد و هەواڵی وەڵامی پرسیارەکانم لێ پرسییەوە وتی "پرسیارەکان بەپێزن، بەڵام ناکرێ لە گوێ و لە کەپووی شتەکان بدەیت و لە ئەسڵی شتەکە نەدەیت، ڕەنگە هەندێ شت بڵێیت سبەینێ یەکێك بڵێ ئەو

كابرایه چ ده‌ڵێ"، تێگه‌یشتم له‌وه ده‌سڵه‌مه‌یته‌وه قسه‌كانی له‌باره‌ی ئه‌و مه‌سه‌لانه‌ی پرسیارم كردوه، به‌تایبه‌ت به‌شه ئاینییه‌كه‌ی، خراپ لێك بدرێته‌وه. ئه‌ڵبه‌ت رێك و راست جوابی نه‌كردم، به‌ڵام له ئاوازی قسه‌كانی تێگه‌یشتم كه حه‌ز ناكات وه‌ڵامیان بداته‌وه ، له‌به‌رئه‌وه منیش له‌سه‌ری نه‌چووم و ده‌ستبه‌رداری بووم.

به‌داخه‌وه ته‌مه‌نی هه‌ڵكشاوی مامۆستا مه‌سعود محه‌مه‌د بوار و تاقه‌تی ئه‌وه‌ی بۆ نه‌هێشته‌وه بتوانێ وه‌ك جاری جاران، كه توانی له‌رێی رامان و بیركردنه‌وه‌ی ورد و بیرمه‌ندانه‌یه‌وه له ماهییه‌تی فه‌لسه‌فه‌ی زاڵ و باو له گۆڕه‌پانه فیكری و سیاسییه‌كه‌ی ئه‌وكاتی كوردستان و عێراق و جیهاندا، كه زۆرێك له عه‌قڵه نوخبه‌وییه‌كان له‌سه‌رسامیدا چۆكیان بۆ دادابوو، په‌ی به خاڵه لاواز و ده‌ردودا و ناسازییه زاتییه كوشنده‌كانی ئه‌و فه‌لسه‌فه‌یه ببات و پێشبینی هه‌ره‌سی بكات، به‌هه‌مان شێوه له فه‌لسه‌فه‌ی باڵاده‌ستی جیهان پاش هه‌ره‌سی بلۆكی خۆرهه‌ڵات و كێشه و ده‌ردوداكانی و ئاسۆكانی ئاینده‌ی ئه‌و فه‌لسه‌فه‌یه و داهاتووی مرۆڤایه‌تی له سایه‌ی باڵاده‌ستیی ئه‌و فیكره‌دا، كه فه‌لسه‌فه‌ی دیموكراسیه‌تی لیبراڵی و سیستمی سه‌رمایه‌داری و ئابوریی بازاڕ و تاكجه‌مسه‌ریی ئه‌مریكا له جیهان و ئامرازه‌كانی جیهانگه‌رایی و شۆڕشی ته‌كنه‌لۆژیا و زانیارییه‌كان و تیۆری حه‌تمییه‌تی كۆتاییی مێژوو له سایه‌ی لیبرالییه‌تی خۆرئاوادا، بكۆڵێته‌وه و فیكر و تێگه‌یشتنێكی فه‌لسه‌فییانه‌ی كوردانه به‌رهه‌م بهێنێ.

ئه‌مه له‌كاتێكدایه كه بۆشاییه‌كی گه‌وره له‌و بواره‌دا له گۆڕه‌پانه رۆشنبیری و سیاسییه‌كه‌ی كوردستاندا به‌گشتی هه‌یه، به‌گشتی مامه‌ڵه‌یه‌كی سۆزباوییانه و ئایدیۆلۆژییانه له‌گه‌ڵ ئه‌و بارودۆخ و سیستم و فه‌لسه‌فه نوێیه ده‌كرێ، هه‌ندێك به‌چه‌شنی خۆته‌سلیمكردنی پیشینه‌كان به فه‌لسه‌فه‌ی ماركسیزم به پاڵنه‌رێكی سایكۆلۆژی و ئایدیۆلۆژی به‌بێ لێكدانه‌وه و هه‌ڵاوێردن و خوێندنه‌وه‌یه‌كی جدی بۆ ئه‌و فه‌لسه‌فه‌یه و دوورایی و ده‌رهاویشته‌كانی ته‌سلیمی بوون، هه‌ندێكیش به پێچه‌وانه‌وه و دیسان له روانگه‌ی ناكۆكییه‌كی ئایدیۆلۆژیی مێژوویی له‌گه‌ڵ خۆرئاوا و فه‌لسه‌فه و پرۆژه‌كانیدا، سه‌نگه‌ریان لێ گرتوه.

**** **** ****

## پرۆفایلی مەسعود محەمەد

مەسعود محەمەد ناوی مەسعود کوڕی مەلا محەمەدی جەلیزادەیەناسراو بە (مەلای گەورەی کۆیە)، لەساڵی ١٩١٩ لە بنەماڵەیەکی ئاینی و زانستی لە دایك بووە. بنەماڵەکەیان بۆ چەندین وەچە خاوەن خوێندنگای شەرعی (حوجرە) بوون، بەڵام نووسەر درێژەی بەو نەریتە نەداوە، بەڵام رێزی لە ناووشۆرەتی زانستی و ئاینیی بنەماڵەکەی گرتووە و بەلای کاری ناشایستەدا نەچووە، بە کەسایەتیی رۆحی و فیکری باوکی سەرسام بووە و زۆرجار لە نووسینەکانیدا ئاماژە بە بۆچوونەکانی دەدات. دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٤٥ کۆلێژی یاسای تەواو کردوە بۆ ماوەی ٧ساڵ لە نیمچە خەڵوەتگیریەکدا ژیاوە کە تێیدا توانای رۆشنبیریی خۆی برەو پێداوە و بناغەی ژیانی فیکری خۆی دارشتوە، لەساڵی ١٩٥١ وەك نوێنەری کۆیە بۆ ئەنجوومەنی نیشتمانیی عێراق هەڵبژێردراوە.

دوای روخانی حکومەتی عەبدولکەریم قاسم لە ١٩٦٣/٢/٨ لە ١٧-٦-١٩٦٤ کراوەتە وەزیری دەوڵەت، لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٦دا لە ئەنجومەنی خزمەتگوزاریی گشتی دامەزراوە و چەند ساڵێك لەو وەزیفەیەدا ماوەتەوە، لە دوای ١٩٦٨یشەوە خۆی بۆ نووسین و دانان تەرخان کردوە.

ساڵی ١٩٧١ بە ئەندامی کارای کۆڕی زانیاری کورد لە بەغدا هەڵبژێراوە و بووەتە جێگری یەکەمی سەرکی کۆڕ و دواتریش بە دەمڕاست (سەرۆك)ی کۆڕ، زمانی کوردی و عەرەبی و فارسی و ئینگلیزی زانیوە و بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی کتێبەکانی نووسیون، چوونە نێو کۆڕ بواری ئەوەی بۆ رەخساند لە نووسینی رۆژنامەوانییەوە بگوێزێتەوە بۆ نووسینی ئەکادیمی و ورد و تۆکمە. ژمارەیەك کتێبی لە بواری فیکر و ئەدەب و زماندا بە کوردی و عەرەبی داناوە و چاپ و بڵاوی کردوونەتەوە، لەوانە:

- چەند حەشارگەیەکی رێزمانی کوردی ، ١٩٧٦.
- وردبوونەوە لە چەند باسێکی رێزمانی کۆرانی، ١٩٧٤.
- زاراوەسازیی پێوانەیی.

– چەپکێك لە گوڵزاری نالی، ١٩٧٦.
– بەرەو راستەشەقامی ئاخاوتنی کوردی، ١٩٧٨.
– حاجی قادری کۆیی ٣ بەرگ ١٩٧٣–١٩٧٦.
– بۆ ئەمیری حەسەن پور لە هەر کوێیەك بێت، ١٩٨٤.
– حەمە ئاغای گەورە، ١٩٨٦.
– مرۆڤ و دەوروبەر، ٣ بەرگ ١٩٧٧–نەوەدەکان.
– لسان الکرد، ١٩٨٧.
– من همومو الحیاة، ١٩٨٨.
– إعادة التوازن الی میزان مختل ١٩٧٧ .
– بیریسوریتروکیا غوربانشتوف، جزءان .
– وجهة نظر في التفسير البشري للتأريخ، ١٩٨٥ .
– الی العظیم غوربانشتوف: تحیة و رجاء، ١٩٨٨ .
– کیفیة النهوض بالمرأة في منطقة الحکم الذاتي .

مەسعود محەممەد لە ١/٤/٢٠٠٢ لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کرد.

* بۆ ئەم ژینینامەیە سوود لە ماڵپەڕی PUK media وەرگیراوە.

## پەراوێزەکان:

(١) حاجی قادری کۆیی، بەشی یەکەم/ مەسعود محەمەد لا١٠.

(٢) مرۆڤ و دەوروبەر، بەشی یەکەم/ مەسعود محەمەد لا١٥-١٦.

(٣)(٤) (٥) (٦) (٧) (٨) هەمان سەرچاوە لا ١٧، ٢٢، ٢٥، ٨٣،٤٦، ١٣٧.

(٩) مرۆڤ و دەوروبەر، بەشی دووەم/ مەسعود محەمەد لا١٤٥.

(١٠) مرۆڤ و دەوروبەر ب١، لا٢٠-٢١.

(١١) وجهة نظر في التفسير البشري للتاريخ/ مسعود محمد، لا١١٠، مرۆڤ و دەوروبەر ب٢ لا ١٤٤-١٤٥.

(١٢) گەشتی ژیانم/ مەسعود محەمەد، چاپی یەکەم، ستۆکهۆلم ١٩٩٢، لا ٢٧٤-٢٧٥.

(١٣) هەمان سەرچاوە لا ٥٦٣.

(١٤) هەمان سەرچاوە لا ٣٥٥.

(١٥) مرۆڤ و دەوروبەر ب١، لا ٤٨-٤٩.

(١٦) وجهة نظر في التفسير البشري للتاريخ لا ٦٢.

(١٧) (١٨) مرۆڤ و دەوروبەر ب١، لا ٤٠، لا٤٤.

(١٩) مرۆڤ و دەوروبەر ب١، لا ٤٧.

(٢٠) مرۆڤ و دەوروبەر ب٢، لا ٣٨.

(٢١) (٢٢) مرۆڤ و دەوروبەر ب١، لا٦٥-٦٧، لا٨٥.

(٢٣) مرۆڤ و دەوروبەر ب١، لا ٧٤.

(٢٤) (٢٥) مرۆڤ و دەوروبەر ب١، لا ٤٢، لا٩٩.

(٢٦) مرۆڤ و دەوروبەر ب١، لا ٩٨-١٠٤.

(٢٧) (٢٨)مرۆڤ و دەوروبەر ب٢، لا ٩٩، لا ١٢٦.

(٢٩) وجهة نظر في التفسير البشري للتاريخ لا٦٧-٦٩.

(٣٠) مرۆڤ و دەوروبەر ب١، لا ١٧.

(٣١) مرۆڤ و دەوروبەر ب١، لا ١٩.

(٣٢) (٣٣) هەمان سەرچاوە لا١٦-١٧، لا١٦-٢٣.

(٣٤) هەمان سەرچاوە لا٤٥.

(٣٦) مرۆڤ و دەوروبەر ب٢، لا١٦٠.

(٣٧) مرۆڤ و دەوروبەر ب١، لا ٢٤-٢٥.

(٣٨) هەمان سەرچاوە لا٢٥-٣٢.

(٣٩) هەمان سەرچاوە لا٨١-٨٢.

(٤٠) مرۆڤ و دەوروبەر ب٢، لا٣٠.

(٤١) هەمان سەرچاوە لا٣٣-٤٣.

(٤٢) هەمان سەرچاوە لا١٦١.

(٤٣) مرۆڤ و دەوروبەر ب١، لا ٤٧-٤٨ له پەراوێزدا.

(٤٤) حاجی قادری کۆیی، بەشی یەکەم لا١٧٥.

(٤٥) حاجی قادری کۆیی، بەشی دووەم لا ١٠١-١٠٦.

(٤٦) حاجی قادری کۆیی، بەشی سێیەم لا٢٧٩-٢٩٥.

(٤٧) هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

(٤٨) هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

(٤٩) حاجی قادری کۆیی، بەشی یەکەم لا٢٧٧-٢٨٦.

(٥٠) (٥١) هەمان سەرچاوە لا ٢٩٥-٢٩٩.

(٥٢) هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

(٥٣) اعاده التوازن الی میزان مختل/ مسعود محمد لا٥٣-٥٤.

(٥٤) حاجی قادری کۆیی، بەشی دووەم لا١٠٦-١١٣/ اعاده التوازن الی میزان مختل لا ٨٠.

(٥٥) حاجی قادری کۆیی، بەشی دووەم لا ١١١-١١٣/ گەشتی ژیانم/ مەسعود محەمەد لا ٤١٠.

(٥٦) مرۆڤ و دەوروبەر ب١ لا ١٦٥-١٦٦.

(٥٧) حاجی قادری کۆیی ب٣، لا ٢٨١–٢٩٥.

مەسعود محەمەد لە چاوپێکەوتنێکی دواتریشیدا کە لە هەفتەنامەی (گولآن) لە ژمارە (١٣٩) لە ٢٠–٩–١٩٩٧دا لەگەڵیدا سازی کرد لەنێو قساندا ئەم باوەڕەی خۆی درکاندەوە، وەك کە دەڵێ "من دەڵێم ئەگەر سەرانی کورد وەك کاك ئەحمەدی شێخ پاك نەبن، دیموکراتیەت لە خۆڕا ناتوانێ لە کوردستان دروست ببێ" هەروەها دەڵێ "ئەگەر توانیت وا بکەی حکومەتەکەت عەدل بێ و وەزیرەکەت دز نەبێ و پۆلیسەکەت حەرام خۆر نەبێدی دەتوانی حکومەتێکی وەك ئەوەی ئیمامی عومەر بە عەدالّەت دابمەزرێنی، سێبەری ئەم عەدالەتە وردە وردە بەسەر هەموو خەڵك رابگات" لا ١٥ .

(٥٨) هەمان سەرچاوە لا ٢٨٠–٢٨١.

***   ***

(*) ئەم وتەیەی هەژار موکریانی، ئەحمەد قازی لە ژمارە ٤٢ی گۆڤاری (سروە)دا، کە لە ئێران دەردەچێ گێڕاویەتیەوە.

(**) ئەو گوتەیەم لە دیمانەیەکی خوسرەو جافدا خوێندەوە کە گۆڤاری (رەنگین) کە جاران لە بەغدا دەردەچوو، لەگەڵی کردبوو.

(***) وتەکەی فەرهاد پیربالّ و کەمال مەزهەر لە وتارێك وەرگیراون، لە رۆژنامەی خەبات لە١/٤/٢٠٠٩دا بلاو کراوەتەوە.

## سەرچاوەکان:

١- مرۆڤ و دەوروبەر بەشی یەکەم و دووەم/ مەسعوود محەمەد. ئەم کتێبە بەشی سێیەمیشی لەم ساڵانەی دواییدا دەرچووە بەڵام هێشتا وەك کتێب بەردەستم نەکەتووە بیخوێنمەوە. دوای نووسینی ئەم بابەتە وێنەیەکیم لە ئینتەرنێت وەرگرتوە، بەڵام راستیەکەی بەهۆی ئەو یەکنەفەسیەی نووسینی کتێبەکە، خوێندنەوەیم لەسەر شاشە پێ زەحمەت بوو.

٢- حاجی قادری کۆیی، ٣ بەرگ مەسعود محەمەد.

٣- گەشتی ژیانم/ مەسعود محەمەد.

٤- بۆ ئەمیری حەسەن پور لەهەر کوێیەك بێت/ مەسعود محەمەد.

٥- چەپکێك لە گوڵزاری نالی (لە گۆڤاری کۆری زانیاری کورد)/ مەسعود محەمەد.

٦- وجهة نظر في التفسير البشري للتاريخ/مسعود محمد.

٧- الى العظيم غورباتشوف تحية ورجاء/ مسعود محمد.

٨- اعادة التوازن الى ميزان مختل/ مسعود محمد.

٩- بيروسترويكا غورباتشوف-نقد و تحليل، الجزء الاول/ مسعود محمد.

١٠- پەرژینی بێدەنگی، دەقی دیمانەیەکە هەڵۆ بەرزنجی لەگەڵ مەسعود محەمەد ئامادەی کردوە و لە ئاداری ١٩٩٦دا وەك کتێبێك لە بەرلین بڵاوی کردوەتەوە.

١١- ژمارەیەك رۆژنامە و گۆڤار و سایتی ئەلیکترۆنی.

**** **** ****

## بڵاوکراوه‌کانی پرۆژه‌ی (تیشك)

| ژ | ناوی کتێب | نووسه‌ر |
|---|---|---|
| ١ | به‌ئیسلامکردنی کورد، ماسته‌رنامه یان هه‌ڵه‌نامه؟ | ن: فازل قه‌ره‌داغی |
| ٢ | نه‌زانیی و بێشه‌رمیی، به‌شێك له چه‌واشه‌کارییه‌کانی مه‌ریوان هه‌ڵه‌بجه‌یی له کتێبی (سێکس و شه‌رع و ژن)دا | ن: عومه‌ر که‌مال ده‌روێش |
| ٣ | ئاشتینامه، وه‌ڵامێك بۆ (خوێننامه)ی زه‌رده‌شتی | ن: ئامینه صدیق |
| ٤ | فه‌تواکه‌ی مه‌لای خه‌تێ، ئه‌فسانه‌ی مێژوونووسێك | ن: حه‌سه‌ن مه‌حمود حه‌مه‌که‌ریم |
| ٥ | صه‌لاحه‌ددینی ئه‌ییوبی، گه‌وره‌تر له ره‌خنه‌گرانی، گفتوگۆ له‌گه‌ڵ پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحه‌ممه‌د حسێن | ئا: ئارام عه‌لی سه‌عید |
| ٦ | به‌ره‌و به‌ختیاری ئافره‌ت (به‌رگی یه‌که‌م) | جه‌مال حه‌بیبوڵڵا (بێدار) |
| ٧ | ئازادیی راده‌ربڕین له رۆژئاوا، له سه‌لمان روشدییه‌وه بۆ رۆجیه گارودی | ن: د. شه‌ریف عه‌بدولعه‌زیم<br>و: وه‌رزێر حه‌مه‌سه‌لیم |
| ٨ | به‌جیهانیکردن، دیدێکی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عه‌بدولحه‌مید<br>و: حه‌مه‌که‌ریم عه‌بدوڵڵا |
| ٩ | کوردستان له‌به‌رده‌م فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حه‌سه‌ن مه‌حمود حه‌مه‌که‌ریم |
| ١٠ | به‌ره‌و به‌ختیاریی ئافره‌ت (به‌رگی دووه‌م) | ن: جه‌مال حه‌بیبوڵڵا (بێدار) |
| ١١ | مێژووی دێرینی کوردستان (کتێبی سێیه‌م) | ن: فازل قه‌ره‌داغی |
| ١٢ | سه‌ده‌یه‌ك ته‌مه‌نی نوورین، مامۆستا عه‌بدولکه‌ریمی موده‌ڕیس به پێنووسی خۆی بناسه | ئا: عه‌بدولدائیم مه‌عروف هه‌ورامانی |
| ١٣ | ده‌وڵه‌تی خیلافه‌ت، بوژاندنه‌وه‌ی کۆمه‌ڵگه و گه‌شه‌سه‌ندنی شارستانییه‌ت | ن: ئیکرام که‌ریم |
| ١٤ | له سه‌رگوزشته‌کانی ژیان، ئه‌ده‌بی گاڵته وگه‌پ، روداوی مێژوویی، بیره‌وه‌ریی | ن: شێخ موحه‌ممه‌د خاڵ |

| | | |
|---|---|---|
| ١٥ | پرۆژەی دەستووری هەرێمی كوردستان<br>رامانو سەرنجو پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |
| ١٦ | بیستو سێ ساڵ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی ڕەشید<br>دكتۆر صەباح بەرزنجی پێشەكی بۆ نووسیوە |
| ١٧ | قورئـان وەحـی ئاسمانـە، نـەك ڕەنگدانـەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەكر حەمەصدیق |
| ١٨ | ئیسلامو سیاسەت، لێكۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلامو سیاسەت | ن: ئارام قادر |
| ١٩ | سوپای ئەییوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا<br>پێكهاتنی، ڕێكخستنی، چەكەكانی، هێزی دەریاییو شەڕو جەنگە گرنگەكانی | ن: پرۆفیسۆر دكتۆر موحسین موحەممەد حسێن<br>و: عوسمان عەلی قادر |
| ٢٠ | پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو | ن: عەبدوڕڕەحمان نەجمەدین |
| ٢١ | رۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەكان لە پێشكەوتنە زانستییەكاندا | ن: د. كاوە فەرەج سەعدون |
| ٢٢ | یەكـەمین دەسـتووری نووسـراو لـە جیهانـدا، بـەڵـگەنامەیەكی گـرنگی سـەردەمـی پێغەمبـەر (صلی الله علیه وسلم) | ن: موحەممەد حەمیدوڵڵا<br>و: شوان هەورامی |
| ٢٣ | ئیـسلامناسیی یـان ئیـسلامنەناسیی، وەڵامێـك بـۆ كتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیكرام كەریم |
| ٢٤ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت (بەرگی سێیەم) | ن: جەمال حەبیبوڵڵا (بێدار) |
| ٢٥ | ئیشكردن نەك تەمەڵی | عەبدولعەزیز پارەزانی |
| ٢٦ | دوورگەی بیناسازان، چیرۆكێكی پەروەردەییە بـۆ گەورەو بچووكی ئەم نەوە نوێیە | نووسـینی: د. عەبدولحەمیـد ئەحمەد ئەبو سلێمان<br>وەرگێڕانـی: ئامینـە صـدیق عەبدولعەزیز |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٧ | زمانی گەردەلوول، خەونی شنەبا<br>کۆمەڵە دیدارێکە لەسەر شیعر، فەرهەنگ، زمان، تەسەووف، ڕۆژهەڵاتناسی، ژن، ڕەخنەی ئەدەبی، ڕووناکبیر و دەسەڵات | فەرهاد شاکەلی |
| ٢٨ | هەڵەبجە ١٨٨٩ ـ ١٩٣٠، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە | ن: عادل صدیق |
| ٢٩ | بەرگری لە قورئان دژی ڕەخنەگرانی | ن: عەبدورڕەحمان بەدەوی<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٣٠ | فەرموودە هاوبەشەکانی بوخاری و موسلیم | ئامادەکردن و وەرگێڕانی: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٣١ | مەلا ئیدریسی بەدلیسی، ڕۆڵی لە یەکخستنی میرنشینە کوردییەکاندا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٣٢ | شێخ مەحمودی حەفید (١٩٢٢ — ١٩٢٥) | ن: ئومێد حەمەئەمین |
| ٣٣ | ئیسلام لەبەردەم دوڕیاندا | ن: لیوبو لدڤایس<br>و: عەبدول حسێن |
| ٣٤ | ڕامیاری لە ئیسلامدا | ن: ئەحمەد کاکە مەحمود |
| ٣٥ | وەڵامی پرسیارەکان، ڕەواندنەوەی کۆمەڵێك گومان سەبارەت بە ڕاستییەکانی ئیسلام | ن: دکتۆر کەریم ئەحمەد |
| ٣٦ | مرۆڤ و پەیامداری | ن: قانع خورشید |
| ٣٧ | سەید قوتب، لە هاتنەدنیاوە تا شەهیدبوون | ن: د. سەلاح عەبدولفەتاح ئەلخالیدی<br>و: تارق نەجیب ڕەشید |
| ٣٨ | عوسمانی کوڕی عەففان، کەسایەتی و سەردەمەکەی | ن عەلی موحەممەد سەللابی<br>و: حەمید موحەممەد عەبدوڵڵا |
| ٣٩ | خوانی ڕووح، توێژینەوەیەکە دەربارەی گەورەیی و پیرۆزیی نوێژ | ن: مەلا ئەحمەدی شەریعە |

| | | |
|---|---|---|
| ٤٠ | ئەلفبێی لاتینی.. زمانی ستاندارد | ئامادەکردنی: رەوشت محەمەد |
| ٤١ | بنەماکانی فیقهی ئیسلامیی(بەرگی یەکەم) | نووسینی: د. صباح بەرزنجی |
| ٤٢ | پوختەیەك دەربارەی راگەیاندن و راگەیاندنی ئیسلامیی | ن: ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی |
| ٤٣ | دەروازەیەك بۆ زانستەکانی قورئان | ن: ئیکرام کەریم |
| ٤٤ | بیرەوەرییەکان دەبنە گرنگ، دیمانەی مامۆستای دێرین ئەحمەد سەعید | ئا: ئەحمەد حسین ئەحمەد |
| ٤٥ | گەنجینەکانی دوورگەی بیناسازان | ن: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبوسلێمان<br>و: بوشرا صدیق عەبدولعەزیز |
| ٤٦ | فڕی فڕی قەل فڕی | نووسینی: مەلا موحەممەدی جەلی کۆیی (مەلای گەورە)<br>قانع خورشید پێشەکی بۆ نووسیوەو رێکیخستووەتەوەو پەراوێزی بۆ داناوە |
| ٤٧ | کۆچ<br>کۆمەڵە چیرۆکێکی واقیعیی کۆمەڵایەتییە | نووسینی:یوسف حاج ئەحمەد<br>وەرگێڕانی: کاوە محەمەد شارباژێڕی |
| ٤٨ | پەروەردەی منداڵان لە ئیسلام دا | نووسینی:<br>د. عەبدوڵڵا ناصح عەلوان<br>وەرگێڕانی:ناصح ئیبراهیم سازانی |
| ٤٩ | ئیمام حەسەن بەننا<br>١٩٠٦ – ١٩٤٩ | نووسینی: مصطفی محمد الطحان<br>وەرگێڕانی:محمد عبدول رحیم |

| ٥٠ | مێژووی کوردەکانی جەزیره ٤٤٧-٦٥٦ ك | نووسینی: ئومێد بەهرامی نیا<br>وەرگێڕانی: عبدالرحیم معرفتی |
|---|---|---|
| ٥١ | ئایا خوا کچی هەیه ؟<br>وەلامێك بۆ کتێبی (کچانی خوا) | نووسینی: ڕوقیه صدیق عبدالعزیز |
| ٥٢ | گەشتی قیامەت | نووسینی: ناصح ئیبراهیم سازانی |
| ٥٣ | بیری ئوسوولّیی ئیسلامی (لەنێوان خوێندنەوەو نەخوێندەواریدا | فاضل قەرەداغی |
| ٥٤ | ئاین له فیکری مەسعود محەمەد دا | نووسینی: عومەر عەلی غفور |